# میـرات و
# ڕێسایەکانی لە شەریعەتدا

نوسینێکی مەنهەجی و زانستییە بە شێوەییکی ڕەوان و ئاسان
شایەنی وتنەوەیە لە کۆلێجەکان و خوێندگاکان


نووسینی
پ. د. ئەحمەد موحەممەد بالیسانی



1436هـ ــ 2014م

# میـرات و

# ڕێسایەکانی لە شەریعەتدا

نوسینێکی مەنهەجی و زانستییە بە شێوەییکی ڕەوان و ئاسان

شایەنی وتنەوەیە لە کۆلێجەکان و خوێندگاکان

نووسینی

**پ. د . ئەحمەد موحەممەد بالیسانی**

مامۆستای شەریعەت لە کۆلێجی یاساو ڕامیاری ـ زانکۆی صەلاحەددین

هەولێر ـ هەرێمی کوردوستان

1436هـ ـ 2014م

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : میرات و ڕێسایەکانی لە شەریعەت دا

ناوی دانەر : پ . د . ئەحمەد شێخ موحەممەد بالیسانی .

تایپ : نووسەر خۆی .

دیزایینی ناوەڕۆك وبەرگ :

تیراژی :

ساڵی چاپ کردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (821) ساڵی 2014 ی پێ دراوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

- يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (11).
- وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ (12).

- ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾(13) .
- ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾(176) .

﴿ صدق الله العظيم ﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزانەی سەرەوە کە لە سورەی نیسادایە پیویستە لەپێشدا لەبەر بکرێ . بۆئەوەی بەشی خاوەن فەرزەکان بە گشتی بێتە بەرو بە ڕوونی دیار بێ .

# ﴿ پێشەکی ﴾

سوپاس و ستایش هەر بۆ خوای گەورە و میهرەبان ، درووددو و سەلام لە سەر پێغەمبەری ئیسلام بێت کە هاتنی ڕەحمەتە بۆ گشت جیهانەکان . هەروەها لە سەر سەحابەو شوێن کەوتوانیان وگشت موسوڵمانانی تر تا ڕۆژی کۆتایی دونیامان .

زانستی میرات زانستێکی وردوو گرنگە پێویستە بیزانین ؛ چونکە بەردەوام مردن و ژین هەیەو پێویستمان پێ دەبێ و دەبێ بیزانین و بەکاری بێنین؛ بۆ ئەوەی کێشەی ناکۆکی گواستنەوەی ساماندریەتی لە نێوان خێزاندا بە هۆی میراتگرتن دروست نەبێ ، وهەر کەسە مافی خۆی بە دادوەری وەربگرێ و نابێ لەبیر بچێتەوە؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( تعلموا الفرائض وعلموه الناس، فإني امرؤ مقبوض، وإن العلم سيقبض حتى يختلف الإثنان في الفريضة فلا يجدان أحدا يفصل بينهما)[1] .

واتە بەشەکانی پێویستکراوی میرات بزانن و فێری خەڵکیشی بکەن؛ چونکە یەکەم زانستە کە نامێنێ، هەتا وای لێدێ، دوو کەس ناکۆکیان ببێ لەسەر بەشەکان کەسیان دەست ناکەوێ دادگاییان بۆ بکات .

هەر لەبەر ئەمەش ئەم زانستەم بە کوردی نووسیوەتەوە بۆ ئەوەی کورد وەکو میللەتێکی موسوڵمانە لەبیری نەکات ، لە لایەکی ترەوە چەند ساڵێك بوو، وانەی بابەتی میراتم لە کۆلیجی شەریعەت لە بەغدا دەوتەوە ، لە سەر بەرنامە و کتێبی

1 ) المستدرك على الصحيحين 4\369 الحديث 7948 .

عەرەبی، کە هاتمەوە کوردستانیش کتێبەکان هەر بە عەرەبی بوون، چونکە تا ئێستا بە ڕەسمی لە کۆلێجەکانا هەر ئەویان بەردەست و لە کاردایە، لە کاتێکا کە لە هەرێمی کوردوستان وەرگێڕان و گۆڕینی بەرنامەو کتێبەکانی قۆناغەکانی پێش قوناغی زانکۆ بۆ کوردی کێشەی ئەوەی پەیدا کردووە، کە خوێندکارەکانمان دەگەنە کۆلیج عەرەبی تێنەگەن و مامۆستا ناچار دەبێ بە کوردی وانەکە شێ بکاتەوە ، لێرەدا وای لێهات کتێب بە عەرەبی و وانە وتنەوە بەکوردی زۆر نەگونجاوو نارێك بوو ، کێشەی ئەوەی پەیدا کرد کە قوتابی کە لەکتێبەکە تێنەگات بۆ خوێندنەوەو پێداچوونەوە، ئیتر فێری نابێ، لە ئەنجامدا هەولی دەر چوونی لە تاقی کردنەوەی مانگەکان و دوایی سالْ لایان زۆر گران دەبێ .

لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی، بابەتی میرات بە خۆم بە کوردی بنووسمەوە بۆ هاسان کاری و چارەسەری ئەم کێشەیە .

زۆر دوورو درێژیشم نەداوەتێ؛ بۆ ئەوەی شێوەکەی زۆر ئاسان و ڕوون بێ ، بە جۆرێکی وا شایەنی ئەوە بێ کە ژیرو زیرەکەکان بەبێ مامۆستا فێری ببن ، ئەگەرنا دەتوانن لای مامۆستایەك بیخوێنن. چونکە ئەمەم لە کۆلیجی یاسای زانکۆی کۆیە و کۆلێجی یاساو ڕامیاری زانکۆی سەلاحەددین لە هەولێر چەند سالْ وتووەتەوە .

ئەوەی ڕاستیە لە سەرەتاوە کتێبەکەی مامۆستا دکتۆر موستەفا زەلْمیم کردە پێشەنگ ، پاشان هی مامۆستا نیزامەددین و مامۆستا دکتۆر موحوممەد گەزنەییشم بەگەلْ خست و بە کوردی وتمەوە ، پاشان وای لێهات بەرە بەرە سوود لە سەرچاوەکانی سەرەکی وەرگرم بۆ ئەوەی زانستی تر بێت و ڕێکتر دەربچێت، هەتا گەییشتە پتر لە پەنجا سەرچاوە .

جا هیوادارم ڕۆڵە خوێندکارەکانی خۆشەویستم کە ئومێدەواری ئاییندەی میللەتەکەمانن سوودی لێ وەر بگرن و سەرکەوتوو بن. خوا بە چاکە لە لیستی چاکە بۆمان بنووسێ بۆ ڕۆژی قیامەت ، ئەو ڕۆژەی کەهیچمان بۆ کەلك نادا تەنیا کردەوەی باش نەبێ .

پاش ئەوە دەڵێم :

ئەگەر ئەتەوێ زۆر بەختەوەر بـیـت *** لەدین و دونیا هەر سەرکەوتوو بیت

فێری زانســـت بـەو بـاوڕ بهێـــــنە *** بـۆ خودای گەورە ســـەر دابنوێـــنە

هەر ئەو هەردووکە سوودت بۆ دەدن *** لە بەهەشتی خـۆش پلەت بەرزەکەن

لەگشت ئایین و هەم گشـت یاســاکان *** لەگشت بەرنامە و هەم ســتمەکان

زانـســــــــتـی میـرات وا دانــەنــراوە *** بەو ڕێکیەی ئیسلام سـستـم نەکراوە

قســــــــەی ناحـەزان خەیـاڵی خـاوە *** ئێســـتاو پاشـــــە ڕۆژ ماڵیـان خراوە

یاخـــوا خودایە هیـدایەتـیـان دەی *** چونـکە نەزانــن یـارمـەتیـان بـدەی

من ئـەوەم نووســــی تا بـۆم بمێـنـێ *** خێــری بـەردەوام لـە پـاش مـردنـێ

ئەی خوای بێ هاوتا لێم قەبوڵ بکەی *** لە ڕۆژی قیـامەت ڕووم ســـپی بکەی

پ.د . ئەحمەد موحەممەد بالیسانی

# ( بەشی یەکەم )

## ﴿ پێشەکیەکانی میرات دابەشکردن ﴾

پێشی چوونە ناو ڕێساو مەسەلەکانی دابەش کردنی میرات هەندێ زاراوەو پێشەکی هەنە پێویستە بزانرێن هەتا بە ئاسانی ناوەرۆکی ئەم بابەتە شایەنی تێگەییشتن بێت، چونکە هەر زانستە دەستەواژەو وشەو پێشەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ شێکردن و لێکدانەوەی .

## { باسی یەکەم }

## ﴿حوکمی میرات و فەلسەفەکەی ﴾

بـۆ زانـیـن:

پێویستە بزانین کە لە پێشی ئیسلامدا لە هەموو لایەکانی جیهاندا بە دادوەری میرات لە نێوان میراتگرەکاندا دابەش نەدەکرا، لە ولاتی عەرەبەکاندا تەنیا میراتیان بە نێرینە دەدا مێیینەکانیان بێبەش دەکرد، چونکە بەشدار نەدەبوون لە جەنگ و کاری گرنگی کۆمەلایەتی... هەروەها لە ئەوروپادا لە بەر ئەوەی سستمێکی دیاریان نەبوو بۆیە بەگوێرەی ویستی خاوەن سامان میرات دابەش دەکرا، هەندێ جار دەدرا

بە گەورەترین کور، هەندێ جاری تریش تەنیا بۆ کوڕان بوو، ئەوانیش هەر مێینەکانیان لە میراتا بێبەش دەکرد . لەم سەردەمەشدا لەبەر نەبوونی ستەمێکی میراتی دادوەر ، وای لێهاتووە هەندێکیا میراتی خۆیان بدەنە سەگەکەیان مرۆڤ بێبەش بکەن .

کە ئیسلام هات خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا بەشێوەکی زۆر دادو دادپەروەریانە میراتی لەنێوان میراتگرەکاندا دابەش کردوە، بەشێوەیەکی وا ئەوەی هۆی میراتگرتنی هەیە بیگرێ و ئەوەی هۆی میراتگرتنی نیە نەیگرێ، لەبەر نەبوونی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ مردووەکە یا لەبەر هەبوونی خزمی لە پێشتر کە هی پاشتر بارنج(حجب) دەکات، یا لەبەر ڕێ لێگرتنی چەند بەرگرێك، یا لەبەر نەهاتنەجێی هەندێ لە مەرجەکانی میراتگرتن .

وا دیارە ئیسلام لە هەموو کاتێکدا یەکسانی لە بەشەکانی میرات لە نێوان میراتگرەکاندا نەکردوو، چونکە یەکسانی لە هەموو جێگەییێکدا دادپەروەری ناهێنیتە دی، بەڵکو لەوانەیە ببێتە ستەم ، وەك ئەندازیارێك و کرێکارێك پێکەوە لە کۆمپانیایەکدا کار بکەن موچەی ئەندازیارەکە بە گوێرەی پسپۆری وگرنگی کارەکەی زیاتر بێ لە هی کرێکارەکە بە دادوەری دەژمێردری با یەکسانیش نەبێ ، ئەندامانی خێزان و خزمایەتیش هەریەکە پلەو پێگەی خۆی هەیە لە سستەمی خێزانەتی وخزمایەتیدا، بە گوێرەی ئەوە بەشەکەی زیاترو کەمتر دەبێ ، دیسان خواییێکی ئەم مرۆڤەی دروست کردووەو بەبەندەی خۆی داناوە زاناترە بە حیکمەت و پیتی ئەم دابەشکرنەی کە خۆی دایناوە، لە کەسێکی کە دروستکراوی خوایە، هەرکەسێ باوەڕدار بێ بە خوایەتی خوا ڕەخنە لەم دابەشکردنە ناگرێ ودانی

پێدادەنێ و، جێبەجێی دەکا ، سەرپێچیکەرو ڕەخنە گر لەسەر بنەمای بێ باوەڕی بەدەرە لە سنووری ئیسلام .

## حوکمی فێربوونی میـرات :

لەبەر ئەوەی دابەش کردنی میرات زۆر گرنگە بۆ پاراستنی مافی دارایی مرۆڤ ، ڕەچاوکردنی دادوەری لە نێوان میراتگرەکاندا، خوای گەورە چەند ئایەتێکی سەبارەت بە میراتا ناردوە ، لەم ئایەتانە دابەش کردنی میراتی پێویست(واجب) کردووە ، واتە فێر بوونیشی هەر پێویستە بەتایبەتی لەسەر زانایان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەم بابەتە، چونکە ئەگەر فێری نەبن نازانن دابەشی بکەن، وەك ڕێسای شەرعی دەڵێت: (مالا یتم الواجب إلا بە فهو واجب)[2] واتە هەر کارێکی واجب بەو نەیێتە جێ ئەویش هەر واجب دەبێ . بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( یا أبا هریرة تعلموا الفرائض وعلموە، فإنە نصف العلم ،وإنە ینسی، وهو أول ما ینزع من أمتي)[3] واتە ئەی ئەبوو هوڕەیرە میرات فێر ببن و فێری خەڵکانیشی بکەن ، چونکە میرات نیوەی زانستە[4] و لەبیر دەچێتەوە، ئەم میراتە یەکەم شتە کەلە ئۆممەتی من دادەڕنێ .

---

2 ) المستصفى 1\217 ، التقریر والتحبیر 1\399 .

3 ) المستدرك علی الصحیحین 4\369 الحدیث رقم 7948 .

4 ) بۆیە فەرمویەتی نیوەی زانستە چونکە میرات بریتیە لە بیرکاری ، زانستیش دوو جۆرە زانستی زانستی و زانستی مرۆڤایەتی ، کە میرات لە بابەتی زانستی دەژمێردرێ وا دا ئەنرێ کە نیوەی زانستە .

هەروەها فەرموویەتی: ( تعلموا الفرائض وعلموه الناس، فإني امرؤ مقبوض، وأن العلم سيقبض حتى يختلف الإثنان في الفريضة فلا يجدان أحدا يفصل بينهما)[5]. واتە زانستی میرات دابەشکردن فێر بن و فێری خەڵکانی بکەن ؛چونکە من دەمرم و وای لێدێ زانستیش نەمێنێ ، هەتا وای لێدێ دوو کەس کێشەیان لە سەر میراتا دەبێت کەسیان دەست ناکەوێ بۆیان چارە سەر بکات .

کەوابوو میرات فێر بوون (فرض الکفایة)[6]یە پێویستە هەندێك لە موسولمانان هەولی فێر بوون و تێگەییشتنی ئەم بابەتە بدەن و دەست کەوتی بکەن، وە پاش گوێی نەدەن، بۆ ئەوەی هەمیشە لەناومانا بمێنێ و چارەسەری کێشەی میراتگرانی پێ بکەین ، پاداشتی بەخێر دەنووسرێ .

## فەلسەفەی میرات :

لە سەرەتاوە گرنگی میرات لەوە دایە کە دەبێتە هۆی پەرت کردن و دابەش کردنی سامان و دارایی لەنێوان میراتگرەکانا؛ بۆ ئەوەی خەڵکان هەمیشە هەولی وەبەرهێنان و دەستکەوتن بدەن، چونکە دەزانن لە پاش مردنیان بەرهەم و هەولەکەیان بۆ ماڵ و منالْیان دەمێنێتەوە و هەست بە ون بوونی هەول و تەقەلاّیان ناکەن، جگە لەوەی کە خێریان دەگاتێ و لای خوا بە فیرۆ ناچێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( إنّك أن تدع ورثَتك أغنياءَ خيرٌ منْ أنْ تدَعَهمْ عالةً يتكفّفون النّاس في أيدِيهم، وإنّك مهما أنفقت من نفقة فإنّها صدقة، حتّى اللّقمة الّتي ترفعها إلى فيّ امرأتك،

5 ) المستدرك على الصحيحين 4\369 الحديث 7948 .

6 )(فرض الکفایة) ئەم فەرزەیە کە ئەگەر کەس پێی هەڵنەستا گشت کۆمەڵگا پێی گوناهبار دەبێ. بەلاّم ئەگە کەسانێك پێی هەڵسان و جێبجێیان کرد گوناه لەسەر گشتیان لادەکەوێ و ئەوانی پێی هەڵسان خێریان دەگاتێ . واتە مەبەست لێرەدا هێنانەدی کارەکەیە لەهەرکەسێ بێت .

وعَسی الله أنْ يرفَعَك فَيَنْتَفِع بكَ ناسٌ...)[7]. واتە میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێلیت باشترە لەوەی لێیانگەڕێی هەژار بن و دەست بۆ خەڵکی پان بکەنەوە ، تۆ هەر بەخشینێکی بیکەی بە سەدەقە بۆت دەژمێردێ ، هەتا ئەو پارووش کە بۆ دەمی ژنەکەت بەرز دەکەیتەوە ، لەوانەیە خوا بەرزت کاتەوەو کەسانێك سوود بە هۆی تۆ وەرگەرن .

هەروەها دەبێتە هۆی پتەو بوونی پەیوەندی و خۆشەویستی لە نێوان میرات لێگیراوو میراتگران ،جا دایك و باوك و منالیان بن، یا کەسانی تر بن کە میراتیان لەنێواندا هەبێ . بەم جۆرە هەموو چینەکانی مرۆڤان هان دەدرێن بۆ پتر وەبەر هێنان وهەست بە بەرپرسی دەکەن ، بە بەرهەم و وەبەر هێنیان کەلکی چینەکانی پاشی خۆیان دەدەن و هەژاری کەم دەبێ و نەبوونی نامێنێ ...! .

بەم جۆرە دەبینین دەوڵەمەند بوونی موسولمان هەر خێرە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، لە ژیانیدا زەکات دەدا و خێرو پیاوەتی دەکا ، لەپاش مردنیشیدا سامانەکەی دابەش دەکرێ بۆ ژمارەیەك لە میرات گرەکانی و دەبێتە هۆی ژیانی چەند خێزانێکی تر .

لە لایەکی ترەوە دەبێتە هۆی پەرت بوونی سامان و دروست نەبوونی سەرمایەداری بێ سنوورو ستەمکار، جگە لەوەی کە ساماندارییەتی خۆڕسکێکی چەسپاوەو هەمیشە مرۆڤ هەوڵ دەدات کە دەستکەوتی هەبێت و بەرهەمی ماندووبوونی خۆی بۆ خۆ بێت، هەتا وای لێدەکات پتر لە پێویستی خۆی پەیدا بکات کە دبێتە میرات بۆ منالی یا کەس و کاری ، لە دواییدا دەژیین و کەلك و سوودی لێ وەردەگرن .

---

[7] ) صحيح البخاري 3\ 1006 الحديث رقم 1233.

ئیتر خوا لە گوناهو کەم و کورتیمان خۆش بێت، ڕێنماییمان بکات بۆ گەیشتنە ڕاستی و ڕاستە ڤینەی هەموو شتێك و زانستێکی پێویست و بە پیت .

## { باسی دووەم }

## ﴿ واتەی چەند دەستەواژەیەك لە میرات ﴾

واتەی میرات ( المیراث): میرات جێگری مردووە لەو مال و ماف و سامانەی بەجێی هێشتووە کە شایەنی دابەشکردنە بۆ سەر میراتگرەکان .

میرات لێگیراو ( الموَرِّث): ئەو کەسەیە کە مردووەو خزم و کەسەکانی زیندووی کە لە ژیان دان و میراتی لێدەگرن بە مەرجەکانی خۆی .

میراتگرەکان (الوارثون): ئەو خزم و کەسانەی مردوەکەنە کە پاش ئەو لە ژیاندا ماون، و ماڵ و سامانە بەجێماوەکەی مردوو بە سەریاندا دابەش دەکرێ، وەکو لە شەریعەتدا دیار کراوە . وەك ژن و منداڵ و دایك و باوکی پیاوێك کە مردووە یا مێردو مناڵ و دایك و باوکی ژنێك کە مردووە . ئیتر بەم جۆرە .

بەجێماوەکە (الترکە): ئەو مال و ماف و سامانەیە کە لەپاش مردوو بەجێ دەمینێ و شایەنی میراتە و دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکانی پاش لێدەرهێنانی مافی خاوەن مافەکان، وەکو قەرزو وەسیەت و ڕەهن و ئەمانەتی خەڵکان ئەگەر لای بێت .

نموونە: یەکێك بمرێ پێی دەڵێن (میرات لێگیراو) و پەنجا ملیۆن دینارو خانوێکی لە پاش بەجێ بمێنێ ئەمە پێی دەڵێن (بەجێماو)، ئەگەر پانزە ملیۆن قەرزار بێ، پێنج ملیونیشی کردبێتە وەسیەت ئەمەشیان مافەکانی خەڵکە، پاش دانەوەی پانزە ملیۆنەکەو وەسیەت بەجێ هێنان بە پێنج ملیۆنەکەی تر، ئەوجا پاشماوەکەی کە خانوو سی ملیۆنە دەمینێتەوە دەبێتە میرات، دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکانی بە گوێرەی زانستی میرات، هەر کەسە بەشی خۆی وەردەگری.

## { باسی سێیەم }

## ﴿ ئەوانەی مافی میراتگرتنیان هەیە[8] ﴾

ئەو خزمانەی مافی میراتگرتنیان هەیە حەوت جۆرن:

**جۆری یەکەم: (أصحاب الفروض) خاوەن بەشە دیار کراوەکان:** ئەوانەن کە بەشی سنوردارو دیارکراویان لە قورئاندا هەیە کە پێی دەڵێن (فرض)، لە میراتگرتنا پلەیان یەکەمە ، کە ئەمانەن:

1 ـ مێرد (الزوج) . 2ـ ژن (الزوجە ). 3ـ باوك (الأب). 4 ـ دایك (الأم) . 5 ـ کچ(البنت). 6ـ کچی کوڕو بەرەو خوار ( إبن الإبن وما نزل).

---

[8] ) شرح الرحبية للدمشقي ص16 و هامشه لمحمد محي الدين عبد الحميد .

7. خوشکی دایکو باوکی( الأخت الشقیقة) واتە لە هەردولادا لای دایك و لای باوکرا خوشکە، واتە لەهەردووکیانە.

8 ـ خوشکی باوکی( الأخت من الأب) واتە تەنیا لە باوکڕا خوشکە .

9. خوشکی دایکی( الأخت من الأم) واتە تەنیا لەدایکڕا خوشکە .

10. برای دایکی(الأخ من الأم) واتە تەنیا لە دایکڕا برایە .

11. باپیری ڕەگەزی ( الجد العصبی) واتە باوکی باوك و بەرەو سەرەوە . 12. داپیر (الجدة) واتە دایکی باوك و بەرەو سەرەوە ودایکی دایك و بەرەو سەرەوە .

بەشەکانی دیار کراو (الفروض) شەشن کە ئەمانەن: ( $\frac{1}{2}$ ) نیوە ، ( $\frac{1}{4}$ ) چارێگ ، ( $\frac{1}{8}$ ) هەشتێك ، ( $\frac{2}{3}$ ) دووسێیەك ، ( $\frac{1}{3}$ ) سێیەك، ( $\frac{1}{6}$ ) شەشێك .

<u>**جۆری دووەم: ڕەگەزیەکان(العصبة)**</u>: واتە خزمی پشتێ: ئەو نێرانەن کە ڕێژەی بەشەکانیان (سەهمەکانیان) بە دەقەکانی قورئان و سونەت بۆ دانەنراوەو پاشماوەی بەشەکانی دیارکراو( فروض) دەبەن. پلەیان دووەمە لە میراتگرتنا ، گشت زانایان لە سەر میراتگرتنیانا کۆکن ، ئەمانەش چوار چینن:

1. کوڕایەتی( البنوة) واتە کوڕو کوڕی کوڕ و بەرەو خوار .

2. باوکایەتی( الأبوة ) واتە باوکو باوکی باوك و بەرەو سەرەوە .

3. برایەتی( الأخوة ) کە ئەمانە دەگرێتەوە: برای لە دایك و باوك ( الأخ الشقیق). ب ـ برای تەنیا لە دایك (الأخ من الأب ). ج ـ کوڕی برای لە دایك و باوك و بەرەو

خوارەوە ( إبن الأخ الشقيق وما نزل ) . د ـ کوڕی برای لە باوك و بەرەو خوارەوە ( إبن الأخ من الأب ومانزل).

4 ـ مامایەتی (العمومة) کە ئەمانە دەگرێتەوە: ا ـ مامی لە دایك و باوك ( العم الشقيق). ب ـ مامی لە باوك(العمّ من الأب) . ج ـ کوڕی مامی لە دایك و باوك و بەرەو خوارەوە ( إبن العمّ الشقيق وما نزل )

د ـ کوڕی مامی لە باوك و بەرەو خوارەوە ( إبن العمّ من الأب ) .

بەڵام هۆکاری ڕەگەزایەتی بۆ میرات بردن سێ جۆرە :

1 ـ **ڕەگەزی خودی (العصبه بالنفس)**: ئەوەیە هۆی ڕەگەزیەکەی خودی خۆیەتی، واتە لە خودی خۆیدا ڕەگەزیە بە هۆی کەسێکی تر نەبوەتە عەصەبە، گشت نێرەکان دەگرێتەوە تەنیا مێردو برای لەدایك نەبێ، ڕێکخستنیان بە گوێرەی لە پێشتری بەم جۆرەیە: کوڕ، جا کوڕی کوڕ هەرچەندە بەرەو خوار بچێ، جا باوك ، جا باپیرو برایەکان کە لەگەڵیا میراتگرن ، جا برای لەدایك و باوك ، جا برای تەنیا لەباوك، جا کوڕانی برای لەدایك و باوك ، جا کوڕانی برای لە باوك، مامی لەدایك باوك، جا مامی لەباوك ، جا کوڕی مامی لەدایك و باوك، جا کوڕی مامی لەباوك.

2 ـ **ڕەگەزی بەهۆی یەکێکی تر(العصبه بالغیر)** : ئەوەیە کە هەر ژنێك بە تەنیا خاوەن فەرز بێت، بەڵام بەهۆی لەگەڵدابوونی پیاویکا پێکەوە میرات بگرن ببێتە ڕەگەز (عصبه) وەك:

کچەکانی مردوو لەگەڵ کوڕەکانی ، جا کچی کوڕی لەگەڵ کوڕی کوڕی ، جا خوشکی لە دایك و باوکی مردوو لەگەڵ براکەی هەمان شێوەیە ، جا خوشکی لەباوکی مردوو لەگەڵ براکەی هەمان شێوەیە .

3 ـ ڕەگەزی لەگەڵ یەکێکی تر(العصبه مع الغیر): ئەوەیە کە هەر ژنێك بە هۆی لەگەڵدابوونی ژنێکی ترا پێکەوە ببنە ڕەگەز وەك: خوشکی لەدایك و باوکی مردوو لەگەڵ کچی مردوەکە، پاشان خوشکی لەدایك وباوکی مردوو لەگەڵ کچی کوڕی مردوەکە، جا خوشکی لەباوکی مردوو لەگەڵ کچی مردوەکە ، جا خوشکی لەباوکی مردوو لەگەڵ کچی کوڕەکەی مردوو .

جۆری سێیەم: گەڕاندنەوە بۆ خاوەن فەرزەکان( الرد): واتە ئەگەر میراتەکە پتر بوو لە کۆی بەشەکانی خاوەن فەرزەکان و عەصەبەیان لەگەڵ نەبوو ، هەر کەس لەوان بە پێی ڕێژەی بەشی خۆی زیادەکە بە سەریدا دابەش دەکرێتەوە. زانایان جیاوازیان هەیە لە میراتگرتنیان و جۆریان ، وەك لە داهاتوودا دیاری دەکەین . ئەگەر هەبن پلەیان لەم سەردەمەدا کە جۆری تر نەماون سێیەمە . بەڵام لە پێشادا پلەیان پێنجەم بوو .

جۆری چوارەم: ( ذووا الأرحام ): ئەو خزمانەی جیای ئەم دوو جۆرانەی پێشەوەن ، واتە جیای عەصەبە و خاوەن فەرزەکانن . هیچ بەش و میقدارێکیان بۆ دیار نەکراوە نە لە قورئاندا نە لە سوونەت. وەك کوڕی کچ و کوڕی پلك و و کچی مام و باوکی دایك . زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە حوکمی میرات گرتنیان وەك لە داهاتوودا باسی دەکەین . پلەیان لەم سەردەمەدا کە جۆری تر نەماون چوارەمە . بەڵام لە پێشاندا شەشەم بوو .

چوار جۆرەکانی تر کە پەیوەندیان بە کۆیلە ئازاد کراوەکانەوە هەیە[9] کە لەم سەردەمەدا نەماون بۆیە باسمان نەکردن پلەکانمان دیار نەکردن چونکە نەماون و پێویستمان پێیان نەماوە .

**واتەی پلە** : پلە پایەی میراتگرتنە بە پێی لە پێشتری بۆ میرات گرتن ، کامەیان پلەی لە پێشتر بێ ئەویان لەپێشتردا میرات دەگرێ، بە شێوەیەکی وا ئەگەر پلەی پێشتر هیچی بۆ پلەی پاشتر نەهێشتەوە هی پاشتر میرات نابا . وەك ئەگەر خاوەن فەرزەکان هەموو میراتیان برد عەصەبەکان هیچ نابەن. یا ئەگەر کوڕی هەبوو براکەی میرات ناگرێت، چونکە پلەی کوڕ لە پێش ترە لە برا. ئیتر بەم جۆرە، ئەم بێبەش بوونە بە عەرەبی پێی دەڵێن (حجب)، بەکوردی پێی دەڵێن بارنج بوون .

## { باسی چوارەم }

## ﴿ بارنج بوون (الحجب) ﴾

**بارنج بوون(الحجب)**: ئەومیە میراتگرێك بە هۆی میراتگرێکی لەپێشتر لە خزمایەتیدا میرات نەگرێ . ئەویش دوو جۆرە :

**یەکەم: بارنج کردنی تەواو**: واتە نایەڵێ بارنج بومکە هیچ ببات، وەك: ئەگەر کوڕ هەبێ کوڕی کوڕ هیچ میرات نابات.

[9] ) المغني لابن قدامة 6\348 فما بعدها والمصدر السابق .

**دوەم: بارنـج بوونی ناتەواو:** واتە بارنجی تەواوی ناکات، بەڵام ڕێژەی میراتگرتنی کەم دەکاتەوە. وەك ژن ئەگەر منالّی لەگەڵ بێت بەشی لە چارێگێك کەم دەبێتەوە بۆ هەشتێك .

**<u>ڕێسایەکانی بارنـج کردن ( قواعد الحجب)</u>:** بارنـج کردن بەم شێوەو ڕێسایانەیە:

1 . ئەگەر کـوڕ هـەبێ ڕەگەزیـەکان (العصـبات) هیچیان مـیرات نـاگرن جگـە لـەو ڕەگەزیانە نەبێ کە بە بەشی دیارکراو (فرض) میرات دەگرن .

2. کوڕی کوڕ وەکو کوڕە بۆ بارنـج کردن ئەگەر کوڕ نەبێ .

3ـ بـاوك گشـت ڕەگەزیـەکان (العصـبات) بـارنـج دەکـات جگـە لـە کـوڕو کـوڕی کـوڕ، هەروەها داپیری لایەنی خۆی بارنـج دەکات .

4 . باپیری لایەنی باوك واتە (باوکی باوك) گشت ڕەگەزیەکان بارنـج دەکـات جگـە لـە بـاوك و کـوڕو کـوڕی کـوڕو دابـیری لـە لایـەنی خـۆی و بـرای لـە دایـك ، بـەڵام بـرای لەدایك و باوك(شقیق) بارنـج ناکات چونکە لەگەڵیا هاوبەشن لە میراتگرتنا .

5 . دایك داپیرەکانی هەردوو لایەن واتە لایەنی خۆی و لایەنی باوك بارنـج دەکات .

6. داپیری دایکی دایك، داپیرەکانی دوورتر لـەخۆی بـارنج دەکـات لـە هـەردوو لایـەن، لایەنی دایکی و لایەنی باوکی .

7. داپیری دایکی باوك ، تەنیا داپیرەکانی دوورتر لە لایەنی باوکی بارنـج دەکات .

8 . برای لە دایك و باوك (الأخ الشنقیق): بـرای لە بـاوك و کـوڕانی براکـان و مامـەکان منالّەکانیان بارنـج دەکات .

9. برای لە باوك: كوڕانی برایانی لە باوكو دایك و هی لە باوك و مامەمكان و منالّەكانی مام بارنج دەكات .

10 ـ كوڕی برای لە دایك و باوك : كوڕەكانی برای لە باوك و مامەكان و منالّەكانیان بارنج دەكات .

11 ـ كوڕی برای لە باوك: مامەكان و كوڕەكانیان بارنج دەكات .

12ـ مامی لەدایك و باوك : مامی لەباوك و گشت كوڕەكانی مامەكان .

13 ـ مامی لەباوك : بارنجی گشت كوڕە مامەكان دەكات .

14 ـ كوڕی مامی لەدایك و باوك : كوڕەكانی مامەكانی لە باوك بارنج دەكات[10] .

## { باسی پێنجەم }

## (( ئەو میراتگرانەی هەرگیز بارنج نابن ))

هەندێ لە میراتگران هەرگیز بارنجی تەواو نابن، واتە بێ بەش نابن وەك :

1ـ مێرد: هەمیشە میراتگرە یا بە نیوە یا بە چارێك .

2ـ ژن: هەمیشە میرات دەگرێ یا چارێك یا هەشتێك .

3ـ باوك: هەمیشە میرات دەگرێ یا بە ڕەگەزی یا بە بەشی دیاركراو وەك : سێیەك یا شەشێك .

10 ) تێبینی: باسی بارنج كردنی (الولاء)م نەكرد چونكە لەم سەردەمەدا نەماوە ...

4 ـ دایك: هەمیشە میرات دەگرێ یا سێیەك یا شەشێك یا سێیەکی پاشماوە .

5 ـ کوڕ: هەمیشە میرات دەگرێ یا بەتەنیا یا لەگەڵ براکانی یا لەگەڵ خوشکەکانی یا لەگەڵ هەردوولا ، یا میراتگری تریشی لەگەڵا بێ وەك دایك و باوك ، ئەوانە هەرگیز بارنج نابن .

6 ـ کچ: هەمیشە میرات دەگرێ یا بە ڕەگەزی لەگەڵ براکانی ، یا نیوە بەتەنیا ، یا بەشێك لە دوو سێیەك لەگەڵ خوشکی تری .

## { باسی شەشەم }

## ﴿ ئەو مافانەی پەیوەندیان بە میراتەوە هەیە ﴾

چوار ماف پەیوەندی بە بە سامانە بەجێماوەکەی مردوو هەیە، دەبێ یەکە یەکە بەجێگەی خۆی بگەیاندرێ؛ بەلاّم هەندێکیان لەپێش هەندێکیانن.

**یەکەمیان:** مەسرەفی ئامادەکرنی مردووەکەو ناشتنیەتی .

**دووەمیان:** دانەوەی قەرز ئەگەر قەرزی لەسەر بێ .

**سێیەمیان:** وەسیەت بەجێ هێنان ئەگەر وەسیەتی کردبێ .

**چوارەمیان:** دابەش کردنی پاش ماوەی سامانەکە بەسەر میراتگرەکانا ، بەم جۆرەی خوارەوە :

## 1. ماڧ یەکەم: مەسرەڧ ئامادەکردن و ناشتن:

مەسرەڧ شوشتن و کفن کردن و ناشتنی ناو گۆڕ پێش هەموو ماڧێك دەخسترێ لای گشت زانایان ئەگەر پەیوەندی بە خود(عین) نەبێ، خودیش ئەوەیە وەك ئەگەر مردووەکە قەرزی کردبێ هیچی نەبێ تەنیا ڕەهنێکی لای خاوەن قەرز دانابێ یا شتێکی کڕیبێ و نرخەکەی نەدابێ، ئەم مەسرەفە لەو ڕەهن و کڕاوەکە دەر نایێ هەتا ماڧ خاوەن ڕەهن و فرۆشیارەکەی لێ دەر نەهێندرێ بە گوێرەی ڕێبازی حەنەڧی و مالکی و شافعی و ئیمامیەکانەوە[11]. ئەگەر هیچی نەما بۆ شوشتن و ناشتن پێویستە لەسەر حیسابی خزمەکانی میراتگر بناشترێ .

بەڵام ئیمامی ئەحمەدو زەیدیەکان دەڵێن پێویستەکانی مردوو پێش ئەم شتانەش دەخسترێ[12]. لە لایەکی ترەوە ئیبن حزمی ئەندەلوسی دەلێ بە هەموو جۆرێکەوە قەرز پیشی پێویستەکانی مردوو دەخسترێ[13].

بەڵام وا دیارە فەرموودەی پێشوو ڕاست ترە کە دەڵێن دانەوەی خودی (عین) مالەکانی خەڵکی پێش پێویستەکانی ناشتنی مردوو دەخسترێ چونکە بە ماڵی خۆی ناژمێردرێ و بوەتە هی خاوەن ماڧەکان. ئەگەر هات و هیچی بۆ نەماوە ناشتنی لەسەر دەولەتە[14] .

11) شرح السراجية في علم الفرائض للسيد الشريف الجرجاني ص4 . الذخيرة 7\103 ، مغني المحتاج 3\4 ، فقه المواريث للأستاذ نظام الدين عبد الحميد ص10 .

12) المغني لابن قدامة 4\285. البحر الزخار 339 ، فقه المواريث نظام الدين عبد الحميد ص10.

13) المحلى لابن حزم 9\253 .

14) میرات و وەسیەت لە شەریعەتی ئیسلام و یاسادا، نووسینی د.ئەحمەد موحەممەد گەزنی ، چاپی دووەم ، ص16.

**تێبینی:** پێویستە بزانین کە مەسرەفی تازیە دانان و خواردن دروست کردن لەگەڵ ئەو مافانەدا نیە و لە ماڵی میراتەوە دەرناهێندرێ؛ چونکە تازیە دانان نەریتێکە خەڵکان دایان ناوەو شەریعەت فەرمانی پێ نەداوە ، بەڵام دڵدانەوەی لێقەوماو واتە ( تازیە لێ کردن) لە هەر جێگەو ڕێگاو بانێکی ببینێ سوننەتە ؛ چونکە پێغەمبەرﷺ فەموویەتی:( من عزّى مصاباً فلهُ مثلُ أجرِه)[15] واتە ئەوەی دڵی لێقەوماوێك بداتەوە هەمان خێری بۆ هەیە. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما من مؤمن يعزّي أخاه بمصيبة إلّا كساه الله سبحانه من حلل الكرامة يوم القيامة)[16]واتە هەر ئیماندارێکی دڵی لێقەوماوێك بداتەوە هەر دەبێ لە ڕۆژی قیامەتا خودا بە بەرگی ڕێزلێگرتنی داپۆشی .

خواردنیش لەسەر خێزانی[17] مردوەکە نیە بەڵکو لە سەر خەڵکی دەوراو پشتیەتی وەك خزم و کەس و دراوسێ و خەڵکی گەرەك، سوننەتە لەم ڕۆژەدا یارمەتیان بدەن و خواردنیان بۆ دروست بکەن[18] چونکە کە حەزرەتی جەعفەرﷺ لە جەنگی ئوحودا شەهید کرا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إصنعوا لآل جعفر طعاماً فإنّه قد أتاهم أمرٌ شغلهم)[19] ، واتە کێشت بۆ منالانی جەعفەر دروست بکەن، چونکە شتێکی وایان بەسەر هاتووە ڕووی وەبەر کێشت دروست کردنیان نەماوە. بەڵام کۆبوونەوەی خەڵك بۆ تازیەو کێشت بۆ دروست کردنیان مەکروهە لای گشت

15) سنن الترمذي 3\385 الحديث رقم 1073 .

16) سنن إبن ماجة 1\511 الحديث رقم 1601 .

17 ) مەبەست لە خێزان لێرە گشت ئەندامەکانی خێزانی مردوەکەیە .

18) المغني لابن قدامة 2\215.

19) سنن أبي داود 3\195 الحديث رقم 3132 .

زانایانی ئیسلام[20]، چونکە بیدعەیەو لای هەندێ زنایان حەرامەو بە شین گێڕان دەژمێردرێ[21] .

**2. ماڤی دووەم: قەرز دانەوە:** قەرز چەند جۆرێکە:

1. قەرزی خوا، وەك زەکاتی نەدابێ یا کەفارەتی یەك لە سەرپێچیەکانی ئاینی[22] لەسەر مابێ یافیدیەی ڕۆژوو جۆرە شتی وا ...هتد .

2. قەرزی خەڵکان وەك پارە یاشتی تری لە خەڵکان قەرز کردبێ نەیدابیتەوە، ئەمەشیان چەند جۆرێکن :

أ ـ ئەو قەرزانەی پەیوەندیان بە (عین)ـەوە واتە بە خودی شتێکەوە هەیە وەکو ڕەهن یا کڕاوێك نرخەکەی نەدرابێ. ئەو جۆرە شتانە خاوەنەکەی ماڤی خودی شتەکەی هەیە .

ب ـ **قەرزی ڕەها** : ئەمەش دوو جۆرە : **یەکەمیان:** ئەو قەرزانەی لەکاتی ساغیدا قەرز کردووە . **دووەمیان:** ئەو قەرزانەی لەکاتی نەخۆشی مردنیدا قەرزی کردووە . ئەم جۆر جۆرەش بۆ ئەوەیە تا بزانین کامیان پیشی کامیان دەخسترێ بۆ دانەوە، ئەگەر سامانە بەجێماوەکەی بەشی هەموویانی نەکرد بەم جۆرەی خوارەوە:

**1. قەرزەکانی خوا ( دیون الله ):** لەسەر ڕێبازی ئیمامی شافعی و ئیبن حەزمی زاهری قەرزی خوا پێش دەخسترێ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( فدين الله أحق أن يقضى )[23] واتە قەرزی خوا شایەنترە بدرێتەوە[24] .

---

20) حاشیة ابن عابدین 2\240 ، مواهب الجلیل 2\288 ،إعانة الطالبین 2\145 ، المغني 2\215 .

21) المجموع للنووي 5\282 .

22 ) وەك کەفارەتی سوێندی لێ کەوتبێ یا کوشتنی بە هەڵەی لە دەست قەوما بێ یا ڤیهاری ژنەکەی کردبێ ...هتد .

بەڵام مالیکیەکان دەڵێن قەرزی خەڵکان وەپێش قەرزی خوا دەخسترێ چونکە خوا پێویستی بە قەرز نیە بە پێچەوانەی مرۆڤان کە پێویستیان پێ هەیە[25].

حەنەفیەکان دەڵێن قەرزەکانی خوا بە مردن هەر نامێنێ؛ چونکە مرۆ سەپاندنی(تکلیف)ی لە سەر نامینێ، تەنیا ئەگەر وەسیەتی کردبێ قەرزەکانی خوای بدەنەوە گشتی بۆ دەدەنەوە، بەمەرجێ میراتگری نەبێ، بەڵام ئەگەر میراتگری هەبێ تەنیا لە سێیەکی ماڵەکەی دەدرێتەوە[26] .

لای حەنبەلیەکان قەرزی خوا لەگەڵ هی خەڵکان یەکسانە ئەگەر ماڵەکەی بەشی نەکرد لەسەر یاسای ڕێژەیی ، هەر قەرزە بە گوێرەی ڕێژەی میقداری خۆی دەدرێتەوە[27] .

3ـ قەرزەکانی خەڵکان: کە پێی دەڵێن قەرزەکانی ڕەها (الدیون المطلقة) کە پەیوەندیان بە ئەستۆوە هەیە نەك بە خودی شتەکە کە پێی دەڵێن (عین)، واتە لەسەر ئەستۆی مرۆڤە ...

زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەنە کە قەرزی خەڵکان هەمووی دەبێ بدرێتەوە بەبێ جیاوازی، هەتا ئەگەر ماڵە بەجێماوەکە بەشی نەکرد لە سەر ڕێسای ڕێژەی ماف

23 ) متفق علیه ضمن حدیث طویل: صحیح البخاري 5|59 الحدیث رقم 1953 ، وصحیح مسلم 3|155 الحدیث رقم 2750 .

24 ) إعانة الطالبین 2\179 . المحلی 9\253 .

25 ) فقه المواریث للأستاذ نظام الدین عبد الحمید ص11 .

26) شرح فتح القدیر 2\359.

27) المغني لابن قدامة 6\138.

لەسەرەکان ( قسمة الغرماء) دەدرێتەوە ، واتە هەر کەسە بەگویرەی ڕێژەی میقداری قەرزی خۆی دەدرێتەوە پێی[28] .

بەڵام حەنەفیەکان دەڵێن قەرزی کاتی ساغی لەپێشترە لە هی کاتی نەخۆشی مردن ، واتە ئەو قەرزانەی لە کاتی ساغیدا کردویەتی لە پێشدا دەدرێتەوە جا ئەگەرماڵەکە بەشی کرد هی کاتی نەخۆشی مردنیشی دەدرێتەوە ئەگەر نا نادرێتەوە[29] .

**3- مافی سێیەم : وەسیەت:** پاش خەرجی ناشتن و دانەوەی قەرزەکان بە گشتی لە ماڵ و سامانی مردوو ئەوجا ئەگەر وەسیەتی حەلالی کردبێ بۆ هەژاران، یا بۆ یارمەتی دانێکی دەزگاییێکی ئایینی، یا بۆ دروستکردنی مزگەوتێك و هەموو جۆرە شتێکی خێر خوازی یا مرۆڤایەتی، وەسیەتەکە جێبەجێ دەکرێ بە مەرجێ لە سێیەکی پاشماوەکە پتر نەبێ ، ئەگەر پتر بوو تەنیا بە قەدەر سێیەکی ماڵەکەی کە ماوەتەوە جێبەجێ دەکرێ و ئەوی تر دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکان ...

**4- مافی چوارەم: میرات:** پاش جێبەجێ کردنی وەسیەت ، ئەوجا نۆرەی میرات دابەشکردن دێت ، جا ئەو ماڵ و سامانەی دەمینێتەوە بە گوێرەی ڕۆنکراوەکانی زانستی میرات لە قورئان و سوننەتدا دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکان، وەك لە بەش و باسەکانی داهاتوودا باسی دەکەین .

28) المدونة الكبرى 13 \236 ، الحاوي الكبير للماوردي 7\28 ، كشاف القناع 2\182 ،المغني 6\174 ،

29) بدائع الصنائع 2\228. مجلة الأحكام العدلية 1\316 .

# { باسی پێنجەم }

## ﴿ پێگەكانی میرات ( أركان الميراث ) ﴾

پێگەكانی میرات سیانن ، هەر كامیان نەبێ كاری میرات گرتن نایێتە جێ ...

**یەكەمیان: میرات لێگیراوەكە كە مردووە ( المورّث)**: ئەو كەسەیە كە مردووە و خزمی هەنەو ماڵ وسامانی لە پاش بەجێماوە و میراتی لێ دەگرن، ئەمەش سێ جۆرە :

**ا ـ مردووی ڕاستەقینەیی ( الميت الحقيقي )**: واتە ئەو كەسەی كە دیارە لە پێش چاوی خەڵكا مردووەو ناشتراوە خەڵكانی دەوراوپشتی پێ ئاگادارن .

**ب ـ مردووی دادگایی ( الميت الحكمي)**: واتە ئەو كەسەی كە بزرە، بۆ ماوەیەكی زۆر هیچ سەرو شوونی دیار نیە و دادوەر حوكم بە مردنی دەدا ، بۆ لابردنی زیان لە سەر خزم و كەسی لەسەر داواكاری خۆیان ، بۆ ئەوەی میراتەكەی دابەش بكرێ و ژنەكەشی ئەگەر بیەوێ شوو بكاتەوە ...

**ج ـ دانراو بە مردوو ( الميت التقديري )**: وەك كۆرپەی ناو سكی دایكی، ئەگەر هۆكاری مردن و لەبەرچوونی بە هۆی دەستدرێژی كردنە سەر دایكی بوو، ئەم كۆرپەیە مافی خوێن سەندنی دەكەوێ بۆ میراتگرەكانی، چونكە وادادەنرێ كە زیندوو بووەو بە هۆی دەست درێژیەكە مردووە .

**دووەمیان: میراتگر ( الوارث)**: ئەو خزم و كەسانەی میرات لێگیراوەكەن كە لە پاش ئەو لە ژیاندان و میراتی لێ دەگرن .جا ج ژیانیان ڕاستی بێ وەك لە پێش

چاوی خەڵکا بن، یا بەڵگەی لە ژیاندابوونیان هەبێ بە شاهید یا بە بیستن . یا ژیانیان بە هاو شێوەی (إستصحاب)ی[30] پێشوودا چەسپا بێ ، وەك مرۆڤی بزر، ئەگەر بەڵگەی مردنی نەبێ هەر بە زیندوو دا دەنرێ لە سەر هاوشێوەی زانیاری پێشوو (استصحاب) میراتی بۆ دا دەنرێ، هەتا ئەنجامی دەر دەکەوێ، یا ژیانیان ئەگەری بێ، وەك كۆرپەی ناو سکی دایك میراتی بۆ دادەنرێ ئەگەر لەکاتی مردنی میراتلێگیراوەکەی دروست بووبێ بە سەلامەتیش لە دایك ببێ میراتەکەی پێ دەدەرێ، ئەگەرنا میراتەکە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکانی تر .

**سێیەمیان : بەجێماو ( التركه):** بریتیە لەو ماڵ و ماف و سوودو سامانەی لە پاش مردووەکە بەجێماوە ، جا ماڵەکە گواستراوە بێ وەك کەل و پەلی ناو ماڵ، یا نەگواستراوە بێ وەك خانوو زەوی و باخچە ، یا لای خەڵك بێ بە قەرز یا بە وێدان یا بەکرێ یا بە دەست بەسەرداگرتن .

هەروەها مافەکانی ماڵیش دەگرێتەوە ئەگەر لایەنی ماڵی زاڵ بێ بەسەر لایەنی کەسایەتیەوە، وەك مافی گێرانەوەی فرۆشراو لە ماوەیێکی مەرجکراودا .

بەڵام ئەگەر مافەکە لایەنی کەسایەتی زاڵ تر بوو بەسەر لایەنی ماڵی بەهیچ جۆریك نابێتە میرات ، وەك فەرمانبەری یا سەرۆکایەتی یا زانایی ومەلایەتی و شێخایەتی و ئاغایەتی و پزیشکی و ...هتد[31].

30 ) ئیستسصحاب ئەوەیة کة ئەطەرحوکمیك یا بارودۆخیك لة ثیشودا هیض بەلطەي طۆراني لەسەر نەبآ هەروەکو خۆي دەمێنێتەوة .

31 ) أحكام الميرلث والوصية للاستاذ الدكتور مصطفى إبراهيم الزلمي ص17 ، فقه المواريث للأستاذ نظام الدين عبد الحميد ص18.

# { باسی شەشەم }

## ﴿ هۆیەکانی میرات گرتن ( اسباب المیراث) ﴾

هۆیەکانی میراتگرتن لە پێشاندا سێ بوون:

**یەکەمیان: هاوسەرینی (الزوجیە)**: واتە ژن و مێردایەتی .

**دووەمیان: خزمایەتی(القرابة)**: وەك منداڵ و دایك و باوك و براو خوشكو ... هتد .

**سێیەمیان وەلائـ ( الولاء )** : کە لەمەو دوا باسی دەکەین .

**یەکەم: هاوسەری (الزواج)**[32]: گرێبەستێکە لەنێوان ژن و پیاوێکی وا بەیەکتری بشێن لە سەر پێکهێنانی خێزان، بە مەرجەکانی شەرعی ، لە سەر شێوەیەك کە ماف و ئەرکەکانیان بەرامبەر بەیەك دابمەزرێ .

زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر ئەوەی کە گرێبەستی هاوسەرینی دروست (صحیح) هۆی میرات گرتنە بە خودی گرێبەستەکە، هەتا ئەگەر پێشی گواستنەوە یەکێکیان مرد ئەوی تر میراتی لێ دەگرێ[33]، چونکە خوا لە ئایەتەکانی میراتدا هاوسەری ڕەهای کردوەتە هۆی میرات گرتن، وەك دەفەرمێ: (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ. . .الخ

---

32 ) زەواج واتە جووت کردنی ژن و پیاو بۆ پێهێنانی خێزان ، کە بە زاراوەی گشتی پێی وتراوە ژن و مێردایەتی ، لەم سەردەمەدا پێی دەڵێن هاوسەری یا هاوسەرگیری ، بەڵام چونکە هاوسەری بەکوردی بە هاوتەمەن وتراوە وام بە باش زانی ناوی نێم هاوسەرینی ، چونکە هەردوکیان پێکەوە لەسەر یەك سەرینا ئەخەون .

33 ) حاشیة ابن عابدین 4\499 ، شرح میارة 2\492 ، إعانة الطالبین 3\223،المغني لابن قدامة 7\189 .

)[34]، ڕەهایی وشەش کاری پێ دەکرێ هەتا نەبەسترێتەوە بە شتێکی وا سنورداری بکا[35]، لێرەدا وشەی (أزواج) نەبەستراوەتەوە ، بە ڕەهایی ماوەتەوە؛ کەوابوو تەنیا بە گرێبەستەکە کە دەبنە هاوسەرو میرات لەیەکتری دەگرن ئەگەر پێشی گواستنەوەش بێ .

بەڵام گرێبەستی هاوسەرگیری (باطل) واتە بەتاڵ یا نادروست بێ وەك خوشکی شیری مارە بکات، بە کۆی زانایان نابێتە هۆی میرات گرتن، هەروەها هی (فاسد) واتە بەد کە هەندێ مەرجی لێ نەهاتبێتەجێ، ئەگەر لای کۆی زانایان بەتاڵ بێ یا بەد بێ وەك ژنی پێنجەم مارە بکات لای گشتیان نابێتە هۆی میرات گرتن[36]. بەڵام ئەگەر لای هەندێکیان (فاسید) بێ و لای هەندێکی تر فاسید نەبێ وەك مارە بەجاش، واتە زانایان بۆچوونی جیاوازیان لە نێواندا هەبێ لەسەر فاسیدیەکەی، تەنیا لای مالیکیەکان دەبێتە هۆی میرات گرتن. لای زانایانی تر ئەویش نابێتە هۆی میرات گرتن[37] .

<u>**هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرینی:**</u> ئەگەر هاوسەرینیەکە هەڵوەشاوە بە هۆی تەلاقدان پێش مردنی یەکێکیان میرات لەیەکتری ناگرن ئەگەر تەلاقەکە پچڕێنەر( بائن) بوو هەتا ئەگەر لە عیدەشدا بمرێ وەك تەلاقی سێیەم[38]؛ چونکە لە یەکتر پچڕاون و نەیان دەتوانی بۆ یەکتر بگەڕێنەوە ، بەڵام ئەگەر تەلاقەکە بچڕێنەر

34) بنوارە ئايةتةكة بة تةواوي لة باسي ميراتي ميَردو ذن .

35) أحكام الميراث والوصية للأستاذ الدكتور مصطفى الزلمي ص10.

36) سەرچاوەکانی پێشوو .

37) هامش شرح الرحبية للاستاذ محمد محي الدين عبد الحميد ص16. فقه المواريث للأستاذ نظام الدين عبد الحميد ص20.

38) تەلاقی سێ بەسێ ئەوەیە سێ جار تەلاقی بدات یا بەیەك ڕستە هەرسێ تلاقی بدات .

نەبوو درفەتی گەڕانەوەی تیادابوو وەك تەڵاقێکی دابێت یان دوو لە کاتی عیددەدا ئەگەر یەکێکیان مرد ئەویتر میراتی لێ دەگرێ ؛چونکە بە شەرع وا دادەنرێ کە هێشتا هاوسەرینی یەکترن لەبەر ئەوەی بۆیان هەیە لە کاتی عیددەدا بەبێ مارەکردنەوە بۆ یەکتر بگەڕێنەوە .

**تەڵاقی هەڵاتوو(طلاق الفار)**: ئەومیە کە پیاوێك لە نەخۆشی مردنا بیت، لەم نەخۆشیەدا ژنەکەی تەڵاق بدا بۆ ئەوەی میراتی لێ نەگرێ، لێرەدا تەڵاقەکەی دەکەوێ، بەڵام میراتەکە هەر دەدرێتە ژنەکەی، بە پێچەوانەی مەبەستە خراپەکەی پیاوەکەی ، بە چەند مەرجێك[39] :

1 ـ دەبێ گواستبێتیەوە: واتە ئەگەر تەنیا مارەی کردبی و نەی گواستبێتەوە میرات ناگرێ.

2 ـ لەم نەخۆشیەدا بمرێت: واتە ئەگەر چاك بووەوە پاشان لە ماوەیێکی تردا مرد ژنەکە میرات ناگرێ .

3 ـ تەلاقەکە لە سەر دواکاری ژنەکە نەبێ . ئەگەر ژنەکە لەو کاتەدا خۆی داوای تەلاقی کرد و تەلاق درا میرات ناگرێ .

4 ـ هیچ ڕێگرێکی میرات گرتنی نەبێ ، وەکو کوشتن یا کوفر .

کۆی سەحابەکان لەسەر ئەم حوکمەن چونکە ئیمامی عوسمان میراتی دا ژنی یەکێك کە لەکاتی نەخۆشیدا تەلاقی دا بوو[40] . هەروەها لەسەر ڕێسای فیقهی کە دەڵێ: (

39) احكام الميراث والوصية للأستاذ الدكتور مصطفى الزلي ص11.

40 ) مختصر خلافيات البيهقي 4\235 . تحفة الفقهاء 2\182 .

من استعجل شيئا قبل أوانه عوقب بحرمانه) واتە ئەوەی خێرایی لە شتێك بكا پێشی كاتی خۆی، سزا دەدرێت بە بۆ نەبوونی شتەكە . بۆ ئەوەی ڕێگەی هەڵاتن لە میراتگرتنی ژن بگیرێ و نەتوانن تەڵاقیان بدەن بەم مەبەستە خراپە .

**دووەم : خزمایەتی (القرابة والنسب):** خزمایەتی بریتیە لەو پەیوەندیەی لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤ پەیدا دەبێ، بە هۆی لە دایك بوون لە ژن و مێردێكی هاوسەرییان دروست بێت، بە هۆی ئەم منداڵ بوونە باوكایەتی و دایكایەتی و كوڕو كچایەتی و خوشك و برایەتی و مام و برازایەتی خارو خوارزایەتی یاخوشكزایەتی و هەموو جۆرە خزمایەتییێكی پەیوەندیان بەو منداڵانە هەیە پەیدا دەبێ. كەوابوو ئەگەر یەكێك مرد خزمەكانی كە لە پاش ئەودا لە ژیاندا ماون میراتگرن، وەك ڕەگەزو لقەكان[41] بە عەرەبی (الأصول والفروع) ، میراتی لێ دەگرن بەگوێرەی كە لە شەریعەت دیار كراوە...كە پێنج چینن[42] :

1. لقەكانی ڕاستەو خۆ[43](الفروع المباشرة): بە نێرو مێیەوە وەك: كوڕو كچ، یا لقی لقەكانی وەك كوڕی كوڕو كچی كوڕو بەرەو خوار، بە مەرجێك هیچ مێیەكیان نەكەوێتە نێوان[44]. ، بەڵام ئەگەر چینی لەپێشتر هەبوو هی پاشتر میرات ناگرێ . بۆ نموونە ئەگەر كوڕ لەژیاندا بوو كوڕی كوڕ میرات ناگرێ .

41 ) مةبةست لة رةطةز باوكو دايكو باوكي باوك و بةرةو سةرةوةية كة ثيَي دةلَيَن ئشت ، مةبةستيش لة لقةكان كورو كض و كوري كورو بةرةو خوارةوة ية كة ثيَي دةلَيَن بةر، ضونكة وةك دار بةردةدا مرؤظيش بةرةكةي منالة .

42 ) هامش شرح الرحبية للأستاذ محي الدين عبد الحميد ص18.

43) واتة كةسيان لة نيوانا نةبيَ وةك كور يا نةوة نةطةر كور نةما بوو .

44) ضونكة ئةطةر ميَ لة نيَوانياندا بيَ دةبيَتة (ذوي الأرحام) واتة خاوةن رةحم واتة خزمي بة هؤي ذن نةك ثياو .

2ـ پشتەکانی ڕاستەو خۆ(الأصول المباشرە): واتە باوك و باوکی باوك و بەرەو سەرەوە، یا دایك و داپیرو بەرەو سەرەوە ، بە مەرجێ پیاوی میرات نەگریان نەکەوێتە ناو .

3ـ لقەکانی کە هاوبەشن لەگەڵ ڕەگەزی ڕاستەو خۆی مردووەکە ( الفروع المشاركة للميت في أصله المباشر): وەك براو خوشك و برازای نێر .

4 ـ لقەکانی هاوبەشن لەگەڵ ڕەگەزی ناڕاستەوخۆی مردووەکە (الفروع المشاركة للميت في أصله غير المباشر): بە مەرجێ نێر بێ . وەك کوڕی برا و کوڕی مام ...

جگە لە مانە ئەوەی بە هۆی ژنانەوە خزم بێ، وەك خاڵ و کوڕی خاڵ و کوڕی پور و کوڕی کچ و ئەم جۆرانە پییان دەوترێ خاوەن ڕەحمەکان(ذوي الأرحام) کە لە باسێکی داهاتوودا باسی دەکەین ...

**سێیەم: وەلاء**[45] **(الولاء)**: واتە لایەنیەتی: ئەوەیە کە لە پێشاندا یەکێك ئەگەر کۆیلەی خۆی ئازاد کردبا لە دواییدا ئەو ئازاد کراوە مردبا ماڵی لە پاش بەجێمابا و هیچ خزم و کەسی میراتگریشی نەبا ،خاوەنەکەی کاتی کۆیلەیی واتە ئازادکەرەکەی میراتی لێ دەگرت[46] بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( **إنما الولاء لمن أعتق** )[47] واتە لایەنی میرات گری ئازاد کراو تەنیا بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی

45 ) شرح الرحبية للإمام محمد بن محمد بن أحمد بن بدر الدين المشقي المصري الشافعي ص16 .

46 ) المغني لابن قدامة 6\548 .

47 ) متفق عليه : صحيح البخاري 2|757 الحديث رقم 2048.صحيح مسلم 2\1145 الحديث رقم 1505 .

کردووە. چونکە وەك خزم دانراوە، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (مولى القوم من أنفسهم)[48] واتە کۆیلەی نەتەوەیێك لە خۆیانە[49].

بەڵام لەم سەردەمەدا کە ئەم دیاردەیە نەماوە، ئەگەر یەکێك هیچ میراتگری نەبێ دەولەت دەبێتە میراتگری، واتە دەبێتە هۆی سێیەم بۆ میراتگرتن؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( انا وارث من لا وارث له)[50] واتە من میراتگری ئەو کەسەم کە میراتگری نەبێ ، مەبەست لە خۆی دەولەتەکەی بووە ، چونکە لەو کاتەدا هەر خۆی سەرۆکی دەولەت بوو .

بۆیە زانایانی ئیسلام بە هەرچوار ڕێبازەکانەوە و زاهیریەکانیش کۆکن لەسەر ئەوەی کە دەولەت میراتگری ئەم جۆرە کەسانەیە کە هیچ میراتگریان نیە، بە مەرجی دادوەری دەولەتەکە و پاکی خەزنەکەی لە ماڵی حەرام[51].

کەوابوو دەتوانین بڵێین، ئێستا هۆیەکانی میراتگرتن سیانن: **1ـ هاوسەری 2 ـ خزمایەتی 3ـ دەولەت .**

---

48 ) صحيح البخاري 6\2484 الحديث رقم 6380 .

49 ) زۆر لة زانایاني ئيَستا باسي ئةم هؤية ناكةن لةبةر ئةوةي نةماوة، بةلاَم وةكو زانست ئةبيَ باسي بكريَ بؤية باسم كردووة نةبادا ئةم مةسةلةية ببضرِيَ و لة داهاتوشدا كؤيلةيي بطةريَتةوةو خةلَكان وابزانن ضارةي نية. هةروةكو بيستومة لة هةنديَ ولاتة طاورةكاني ئيَستا منال دةفرؤشيَ وةكو ضين لة هةنديَ ولاتي تريش نافرةت دةفرؤشريَ وةكو ئيسرائل و رؤذهةلاتي ئةوروثا.

50 ) سنن ابن ماجة 2\879 الحديث رقم 2634 . ، سنن أبي داود 3\123 الحدايث رفم 2901 .

51 ) المبسوط للسرخسي 8\113، مواهب الجليل 6\414 ، روضة الطالبين 12\181 ، المغني 6\290، المحلى 11\63 .

# { باسی حەوتەم }

## ﴿ میرات نەگرەکان ﴾

هەندێ کەس لەوانەیە لە واقیعدا خزم بن، بەڵام لە شەرعدا بە خزم ناژمێردرێن؛ چونکە هۆکاری خزمایەتی دروستیان لە نێواندا نیە یا نەماوە، وەك منالْکی لە زینا پەیدا بووبێ، یا باوکەکەی لیعانی لەگەڵ دایکەکەیا کردبێ.

هەندیکی تر هەر خزم نین و بێگانەن، بەڵام بەگەڵ خێزان دەخسترێن وەك هەڵگیراوە (لقیط) یا بەمناڵی خۆ کردن (التبتي)، ئەمانە لەبەر ئەوەی هۆی میرات گرتنیان لێ نایەتە جێ، زانایان باسی حوکمی میرات نەگرتنیان کردووە ، یەکە یەکە باسیان دەکەین:

1 ـ **یەکەم: منالْی لیعان** : ئەگەر پیاوێك ژنەکەی تاوانبار کرد بە زیناو هیچ بەڵگەی لە سەر نەبوو ژنەکەش لەدادگا دانی پێنەدا لێرەدا دادوەر لیعانیان[52] پێ دەکا جا لە یەکتری جودا دەبنەوە، جا ئەگەر پاش لیعانەکە منالێکیان بوو پێی دەوترێ منالْی لیعان . ئەم جۆرە منالە و باوکە لیعانکەرەکەی میرات لە یەکتری

52) ليعان ئەوقية كة ئياةكة ضوارجار شايةتي بدا كة راست دةكا جاري ثينجةمبش شايتي بدات كة لةعنةتي خواي ليَ بيَ ئةطةر درؤ بكات ، ذنةكةش لة سزاي دادطا رزطاري دةبآ ئةطةر ضوارجار شايةتي بدا كة ثياوةكةي درؤ دةكات جاري ثينجةميش شايةتي بدات كة غةزةبي خوا بيطريَ ئةطةر ثياوةكةي راست بكا . بةطويرةي فةرموودوةي خوا لة سولرةي نور: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (6) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (7) وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (8) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ (9))

ناگرن؛ چونكە لای باوكەكە بەمناڵی ئەو ناژمێردێ ، تەنیا ئەگەر كابرا لە لیعانەكە پەشیمان بوەوە و سزای (قذف)ی واتە ـ درۆ بەستن بە ژنەكەی ـ لێ دەركرا ئەوجا میرات لە یەكتری دەگرن. بە مەرجێك پەشیمان بونەوەكە پاش مردنی منالەكەی نەبێ نەبادا بەشیمانیەكەی لەبەر تەماعی میراتەكە بێت .

بەڵام منالْ و دایكەكە هەردووكیان میرات لە یەكتری و لە خزمی یەكتری دەگرن لای كۆی زانایانی ئیسلام[53] .

**2ـ دووەم: منالی زینا**[54]: منالێكی كە لە زینا پەیدا بوو‌بێت خۆی و پیاوە زیناكەرەكەی كە لێی بووە میرات لە یەكتری ناگرن، هەروەها لە خزمی یەكتریش ناگرن لای زۆرترینی زانایانی ئیسلام[55]، چونكە خزمایەتی(نەسەب) بە هاوسەرگیری شەرعی دادەمەزرێ بە زینا و ڕێی حەڕام دانامەزرێ .

بەڵگەیان ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الولد للفراش وللعاهر الحجر)[56]. واتە منالْ هی سەرجێی ژن و مێردایەتیە لەش فرۆشیش بەردی بۆ هەیە .

لەگەڵ ئەوەشا لای كەمێك لە زانایان وەك حەسەنی بەسری و ئیبن سیرین و ئیسحاق كوڕی ڕاهەوەیهی ئەگەر كابرای زیناكەرەكە ئیعتیرافی پێ كرد دەبێتە كوڕی و میرات لە یەكتری دەگرن، هەروەها لای ئیبراهیمی نەخەعی و عوروەی كوڕی زوبەیرو

53) المصادر السابقة نفسها . مع فقه المواريث للأستاذ نظام الدين عبد الحميد ص 23 ،

54) زینا ئەوەیە كە ئیاویك و ذنیك جیماع لەطەلَ یەكا بكەن بەبآ ئەوەي طریَبەستي هاوسەریني یا هۆي شەرعي دروست بووني ئەم كارەیان لەنیَواندا هەبیَت .

55) تبيين الحقائق 6|241 ، بداية المجتهد 2|268 ، مواهب الجليل 5|240، الحاوي الكبير 8|162 .

56) صحيح البخاري 2|224 الحديث رقم 1948 ، صحيح مسلم 2|1080 الحديث رقم 1457 .

سولەیمانی کوڕی یەسار، ئەگەر دوای ئیعتیرافەکە سزا درا دەبێتە کوڕی، واتە میراتی لێ دەگری[57]. لە ئەبو حەنیفە دەگێرنەوە ئەگەر ژنەکە لە زینا منالی بە زکی کەوت لەو کاتەدا مارەی بکات و داپۆشی دەبێتە منالی ئەوو میراتی لێ دەگری[58]...

بەلگەشیان ئەوەیە دەڵێن ئەگەر منالی لیعان باوکی ئیعتراقی پێ بکات بە منالی ئەو دەژمێردرێت، ئەمەش لە سەر ئەو قیاس دەکرێت. بەلام بۆچوونی یەکەم ڕاسترە چونکە بەلگەیان دەقی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ ئەوانی تر قیاسیان کردووە؛ قیاسیش بەرامبەر بە دەق بەتاڵەو وەرناگیرێ .

بەلام دایکی منالەکە و خزمی دایکەکە لای زۆرینەی زانایان میراتی لێ دەگرن و ئەویش میرات لە دایکەکەی و خزمەکانی دەگرێت[59] .

**3ـ هەلگیراوە (اللقیط):** ئەگەر یەکێك منالێکی فرێدراوی هەلگرتەوەو بەخێوی کرد خێرێکی زۆری دەگاتێ و پاداشتی لای خوا بۆ هەیە، بەلام لای گشت زانایان بەهیچ جۆرێك میرات لە یەکتری ناگرن؛ چونکە هیچ پەیوەندییێکی خزمایەتی میراتگریان لە نێواندا نیە و هیچ لە هۆیەکانی میراتگرتنیان لێ نایێتە جێ.

**4ـ بە کوڕی خۆ کردن (التبنی):** لە سەردەمی جاهیلیەکانا وا باو بوو کە پیاوێك دەیتوانی یەکێکی تر بکاتە کوڕی خۆی، واتە خۆی بە باوکی ئەو دابنێ، خوێنگرو میرات گری یەکتر بن . کە قورئان هاتە خوارەوە ئەم نەریتە چەوتەی حەرام کرد؛ چونکە کارێکی درۆ بوو، وەك لە سوڕەی ئەحزابدا فەرمویەتی: (وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ

57) الحاوي الكبير8|162 . المغني لابن قدامة 6|228 .

58 ) المغني لابن قدامة 6|228 .

59) تبيين الحقائق 6|241 ، بداية المجتهد 2|268 ، مواهب الجليل 5|240، الحاوي الكبير 8|162 .

أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ (4) ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا (5))واتە ئەوانەی کە ئیددیعایان دەکەن کە کوڕتانن خوا نەیکردوونەتە کوڕتان، ئەمە تەنیا قسەی بەدەمتانە، خوا حەق دەفەرمێ و ڕێنمای ڕێی ڕاستان دەکات . بەناو باوکیان هەردەن لای خوا وا داد ترە ، ئەگەر نەتانزانی کێ باوکیانە ئیتر براتانن لە ئاییندا و پشتگیرتانن . گوناهتان لە هەڵە کردنا ناگاتێ بەڵام گوناهبارن لەوەی دڵتان بە ئەنقەست دەیکات ، لەگەڵ ئەوەشا خوا لێبوردەو بە ڕەحمە .

بۆیە گشت زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە بەمناڵ کردن حەرامە ، ئەم مناڵە و باوکە درۆیەکەی میرات لە یەکتری ناگرن ، چونکە مناڵی خۆی نیە ، چونکە مناڵی مرۆ ئەو کەسەیە کە لە تۆی خۆی و لە ژنەکەی خۆی بوە .

## { باسی هەشتەم }

## ﴿ مەرجەکانی میرات گرتن ﴾

مەرج ئەمەیە کە لەکاتی نەبونیا کارەکە نایێتەجێ، بەڵام لازم نیە ئەگەر مەرجەکە بوو کارەکەش ببێ . وەك دەست نوێژ مەرجی دروست بوونی نوێژە ئەگەر دەستنوێژ نەبوو نوێژەکە دروست نابێ، بەڵام لەوانەیە یەکێك دەست نوێژ هەڵبگرێ و نوێژیشی پێ نەکات .

لێرەدا دابەش کردنی میرات پەنا دەداتە چەند مەرجێك ئەگەر گشتیان یان یەکێکیان نەبو میرات ناگیرێ ، ئەم مەرجانەش ئەمانەن:

**یەکەم : مردنی میراتگر**: مردنی ڕاستەقینیی (حقیقە) بێت ، یا(حوکمی) واتە حوکمی دادگای پێ بدرێت کە مردووە . یا بەدانان (تقدیر)ی بێت .

مردنی ڕاستەقینەیی ئەوەیە کە یەکێك لەبەر چاوی خەڵکدا بمرێت و دیارو ئاشکرا بێت، یا بە بیستنێکی واقعی بڵاو، واتە لای خەڵکان بڵاو بێتەوە کە مردووە و گومانی تیادا نەمابێ ، یا بە شایەتی کەسان لای دادوەر بچەسپێت کە مردووە .

مردنی حوکمی ئەوەیە کە یەکێك بزر بوبێت و ماوەیەك دەر نەکەوێتەوە منالّ و خێزانی زیاندار بن لە نەزانینی سەرووشونی ، بچنە لای دادگا شکات بکەن، جا دادگا پاش لێپێچانەوەییێکی دروست بڕیار بدا بە مردنی ئەم کەسە؛ هەتا ژنەکەی بتوانێ پاشی عیددە گرتنی مردنی مێرد بەبڕیار شوو بکاتەوە، لەلایەکی ترەوە میراتگرەکانیش میراتی لێ بگرن . لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە بە پێی حوکمی دادگا بە مردوو دانراوە و پێی وتراوە مردنی حوکمی .

مردنی بەدانان واتە وا دادەنرێ زیندو بوەو جا مردووە ، وەك کۆلپەی ناو سکی دایکی، ئەگەر یەکێك دەستدرێژی کردە سەر دایکی وەك لێی بداو لێدانەکە ببێتە هۆی لەبەرچوونی منالّەکە ، وادادەنرێ کە ئەو منالّە زیندو بوەو بە هۆی لێدانی تاوانبار مردووە و دەبێ خوێن (دیە) بداتە میرات گرەکانی ئەم مندالّە[60].

60 ) الفواكه الدواني 2|249 . فقه المواريث للإستاذ نظام الدين ص24 ، أحكام الميراث والوصية للدكتوٶر مصطفى الزلمي ص19.

**مەرجی دووەم: ژیانی میراتگر:** واتە ئەو کەسەی میرات دەگرێ دەبێ لە ژیان دابێت چونکە مردوو میرات ناگرێ لە بەر ئەوەی شایستەی میرات گرتن نیە، ئەمەش سێ جۆرە: ژیانی ڕاستەقینەیی و ژیانی بەدانان و ژیانی حوکمی ....

ژیانی ڕاستەقینەیی: ئەومیە کە لەبەر چاوی خەڵکانی دەوراو پشتی لە ژیاندا بێت و دیار بێت، ئەگەر کەسێکی وای مرد کە میراتی لێ بگرێ میراتی لێ دەگرێ و ئەیدەن پێ ی .

ژیانی بەدانان: ئەوەیە وەك ژیانی کۆلپەی ناو سکی دایکی بە ژیاو دادەنرێ ، ئەگەر خزمێکی وای لێ مرد میراتی لێ بگرێ، بەشەکەی بۆ دادەنرێ هەتا لە دایك دەبێ، ئەگەر بە زیندوویی لەدایك بوو بۆ ماوەیەیێکی کورتیش بێ میراتەکەی پێ دەگات ئەگەر بە مردویی بوو پێی ناگات و بەشەکەی بۆ میراتگرەکانی تر دەگەڕێتەوە [61].

**مەرجی سێیەم: نەبوونی بەرگر:** واتە هیچ بەرگرێکی میرات گرتنی نەبێ وەك: کوشتن و جیاوازی ئایین و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام ، کە لە باسی داهاتودا بە درێژی باسی دەکەین ...

61 ) المصادر نفسها .

# { باسی نۆیەم }

## ﴿ ڕێگرەکانی میرات (موانع المیراث) ﴾

هەندێ کاروبار هەیە ئەگەر ڕوویدا یا هەبێ نایەڵێ خاوەنەکەی میرات بگرێ، واتە ڕێ لە میرات گرتنی میراتگر دەگرێ و دەبێتە نەهێڵی میرات گرتنی ، کەوابوو ڕێگر (مانع): ئەوەیە ئەگەر هەبێ حوکمەکە دانامەزرێ با هۆکارەکەشی هەبێ[62] واتە نایەڵێ هۆیەکەی کار بکا . لێرەدا با هۆی میراتگرتنیش هەبێ بەڵام ئەگەر ڕێگر هەبوو میرات ناگرێ. جا چەند ڕێگرێك هەن ئەگەر یەکێکیان لە میراتگرەکەدا هەبوو یا هاتەجێ ناهێڵی میرات بگرێ. ئەم ڕێگرانەش ئەمانەن:

**ڕێگری یەکەم: کوشتن:** ئەوەی میرات لێگیراوی خۆی بکوژێ لە میراتەکەی بێبەش دەبێت وهیچ میراتی پێ نادرێ؛ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە فەرمویەتی: (القاتل لا یرث)[63] واتە کوژەر میرات ناگرێ ، ئەگەرچی ئەم حەدیسە لاوازە[64] بەڵام (جمهور)ی زۆربەی زانیان لەسەر ئەوەن کە کوژەر میرات ناگرێ، تەنیا ئیبن حەزم و سعیدی کوڕی موسەیەب لە قسەیێکیداو ئیبن و جوبەیرو خەواریجەکان دەڵێن میرات دەگرێ[65] لەبەر ئەوەی حەدیسەکە لاوازە کاری پێناکرێ .

---

62 ) المختصر في أصول الفقه 1|67 ، قواعد الفقه للبركتي 1|459

63 ) سنن إبن ماجة 2|883 الحديث رقم 2645 .

64 ) تلخيص الحبير 3|84 ، خلاصة البدر المنير 2|136 .

65 ) فقه المواريث أ. نظام الدين عبد الحميد ص27 .

(جمهور) واتە زۆربەی زانایان کە دەڵێن میرات ناگرێ جیاوازیان لەنێواندا هەیە کە چ جۆرە کوشتنێك دەبێتە ڕێگر لە میراتگرتن ... بەم جۆرە :

لای حەنەفیەکان ئەو کوشتنەی تۆڵە یا دیە و کەفارەتی لەسەرە وەك: کوشتنی بە ئەنقەست و شێوەی ئەنقەست و بە هەڵە و شێوەی هەڵە ( القتل العمد وشبه العمد والخطأ والجاري مجرى الخطأ) ڕێگری میراتن ، بەڵام کوشتنی بە هۆکار (القتل بالتسبب) و کوشتنی بە حەق[66] و کوشتنی منداڵ و شێت و سەر خۆش[67] ڕێگری میرات گرتن نین[68] .

لای مالیەکان تەنیا کوژەری بە ئەنقەست (القتل العمد) میرات ناگرێ ، ئەوانی تر وەك کوژەری بە هەڵە تەنیا میرات لە دیەکە ناگرێ دەنا هی ماڵەکە دەگرێ[69] .

لای شافیعیەکان هەموو جۆرەکانی کوشتن دەبنە بەرگری میرات گرتن، کوژەر بە هیچ جۆرێك میرات ناگرێ[70]. لای حەنبەلیەکانیش هەر وایە تەنیا دەڵێن کوژەری کوشتنی بەحەق وەك (قیصاص) تۆڵە سەندنەوە یا بەرگری لە خۆکردن و لە شەرەف و ناموس میرات دەگرێ[71] ...

**ڕێگری دووەم: جیاوازی ئایین:** کۆی (ئیجماعی) زانایان لەسەر ئەوەن کە کافر میرات لە موسوڵمان ناگرێ ، زربەی زانایانیش لەسەر ئەوەن کە موسوڵمانیش میرات لە

---

[66] ) کوشتنی بە حەق ئەوەیە یەکێك بەرامبەر بە تاوانەکەی بکوژرێتەوە ئەگەر سزاکەی کوشتن بێت.

[67] ) واتە کوژەری منداڵ یا شێت یا سەرخۆش .

68 ) شرح السراجية في علم الفرائض ص9 .

69 ) الفواكة الدواني شرح رسالة القيرواني 1|585 .

70 ) الحاوي الكبير8|85 .

71 ) مسائل الإمام أحمد بن حنبل 2|404.

کافر ناگرێ[72]. بەلگەیان فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: **(لا یرث المسلم الکافر ولا الکافر المسلم)**[73]. واتە موسولمان لە کافر میرات ناگرێ و کافریش میرات لە موسولمان ناگرێ .

بەڵام هەندێ زانایانی سەحابەو تابعین بۆچوونیان وایە کە موسولمان میرات لە کافر دەگرێ، وەك ئیمامی عومەرو موعازی کوری جەبەل وموعاویە ﷺ هەروەها لە تابعینەکان مەسروق وسەعیدی کوری موسەیەب و وئبراهیمی نەخەعی وئیسحاق و هەندێ تابعینی تر[74]. بەلگەشیان ئەمانەیە:

1- فەرمووودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: **(الإسلام یعلو ولا یعلی)**[75]واتە ئیسلام بەرز دەبێتەوە هی تر لەسەر ئەو بەرز نابێتەوە ، ئەگەر چی ئەم حەدیسە بە لاواز دانراوە[76]، بەلام ئەوەی بەهێزی دەکات ئەومیە کە ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەی بە (موقوف) لە ئیبن و عەباسەوە ڕیوایەت کردووە[77]..

72 ) البحر الرائق 8\ 571، الإستذكار 5| 369 ، بداية المجتهد 2| 265، إعانة الطالبين 3|223، المغني لابن قدامة 6|246.

73 ) متفق عليه | صحيح البخاري 6|2484 الحديث رقم 6383 ، صحيح مسلم 3|1233 الحديث رقم 1614 .

74 ) شرح النووي على صحيح مسلم 52/11. المغني لابن قدامة 6|246 ، المحلى 9|305 .

75 ) سنن البيهقي 6|205 الحديث رقم 11935 ، سنن الدارقطني 3|52 ، مسند الروياني 2|37 الحديث رقم 783 ،كنز العمال 1|49 الحديث رقم 246 ..

76 ) أنظر تلخيص الحبير 4\126الحديث رقم 1921 إذ قال ضعيف جدا، وانظر خلاصة البدر المنير 2|362، أذ قال: حديث (الإسلام يعلو ولا يعلى عليه) رواه الدارقطني في سننه من رواية عائذ بن عمرو المزني بإسناد واه ، ولفظه (الإسلام يعلو ولا يعلى) والطبراني في أصغر معاجمه ولبو نعيم والبيهقي في كتابيهما دلائل النبوة من رواية عمر بن الخطاب، ولفظه: ( الحمد لله الذي هدانا لهذا الدين الذي يعلو ولا

2ـ لەبەر ئەم ڕیوایەتە: ( عَن أبي الأسوَد الدئيلي قال: كانَ معاذ باليَمن فارتفعوا إليه في يهوديّ مات وترك أخا مُسلماً فقال معاذ: إنّي سمعت رسولَ الله ﷺ يَقولُ: إنّ الإسلام يَزيدُ ولا يَنقصُ فورّثه)[78] . واتە لە ئەبو ئەسوەدی دوئەلیەوە کە وتوویەتی: موعاز لە یەمەن بوو ڕووداوێکیان بۆ بەرز کردەوە کە جولەکەیێك مردبوو برایێکی موسولمانی میراتگر بوو ، موعاز فەرمووی من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کە دەفەرمویٚ: ئیسلام زیاد دەکات کەم ناکات. جا میراتی دایە برا موسولمانەکەی .

3ـ هەتا میرات نەگرتن نەبێتە ڕێگر لە موسولمان بوونی خەڵکانی تر، یا نەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام .

**میرات گرتن لە نێوان ئایینەکانی غەیری ئیسلام:** لای ئیمامی مالیك و ڕیوایتێك لە ئیمامی ئەحمەدو هەندێ زانای تر: خەڵکانی ئایینەکانی تر وەك یەکێك نەسرانی بێت و ئەوی تر جولەکە بێت میرات لە یەکتری ناگرن ، لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرمویٚ: (لا يتوارث أهل ملتين)[79] واتە خەڵکی دوو ئایین میرات لە یەکتر ناگرن. بەڵام لای (جمهور) واتە زۆربەی زانایان: ئایینەکانی تر گشتیان یەك میللەتن

---

يعلى) قاله الأعرابي في حديث طويل، وفي سنده محمد بن علي بن الوليد السلمي البصري، قال البيهقي الحمل فيه على السلمي، قال الذهبي صدق والله البيهقي فإنه حديث باطل، قلت: لكن ذكره البخاري في صحيحه في الجنائز تعليقا موقوفا فقال: قال ابن عباس:( الإسلام يعلو ولا يعلى) .

77 ) صحيح البخاري 1|454 باب إذا أسلم الصبي .

78 ) مسند الإمام احمد بن حنبل5|230 الحديث رقم 22058، سنن أبي داود 3|126 الحديث رقم 2912 ، المستدرك على الصحيحين 4|383 الحديث رقم 8006 ،

79 ) سنن النسائي4|82 الحديث رقم 6382 ، سنن ابي داود 3| 3|125 الحديث رقم 2911 ، سنن إبن ماجة 2|912 الحديث رقم الحخديث رقم 2731 ، وقال الحاكم صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه | المستدرك 2|262 الحديث رقم 2944 .

و میرات لە یەکتری دەگرن[80] لە بەر ئەو ڕێسایەی کە دەڵێ (الكفر ملة واحدة) واتە کوفر یەك میللەتە کە گشت ئەوانەی بەدەرن لە ئیسلام دەگرێتەوە .

**ڕێگری سێیەم: هەڵگەڕانەوە:** واتە موسوڵمانێك لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕێتەوە بچێتە سەر ئایینێکی تر یا نەچێتە سەر هیچ ئاینێك وببێتە بێ ئایین. جا ئەم جۆرە کەسە هەڵگەڕاوەیە لە ئیسلام حوکمی میراتەکەی بەم جۆرەیە:

أ ـ لای (جمهور) زۆربەی زانایان گشتی ماڵەکەی دەچێتە(بيت المال) واتە گەنجینەی دەوڵەت و بۆ هیچ کەس نابێت .واتە کەس میراتی لێ ناگرێت[81] .

ب ـ لای ئیمامی حەنەفی و سەوری: ئەو ماڵەی پێشی هەڵگەڕانەوەی دەستکەوت کەوتووە دەبێتە هی میراتگرەکانی، بەڵام ئەوەی پاشی هەڵگەڕانەوەی لە کاتی کافریدا دەستی کەوتووە دەچێتە(بيت المال) واتە گەنجینەی دەوڵەت[82] .

ج ـ لای حەزرەتی ئەبوبەکرو ئیمامی عەلی ئیبن و مەسعود و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو سەعیدی کوڕی موسوییەب و حەسەنی بەصری و عەتاو شەعبی وحەکەمی کوڕی عوتەیبەو ئەوزاعی وئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی و هەردوو هاوەڵەکانی ئەبو حەنیفە[83] گشتی ماڵەکەی بە بێ جیاوازی پێش و پاشی

80 ) المبسوط 30|30، الحاوي الكبير 8|81، المغني لابن قدامة 6|247.

81 ) الإستذكار 5| 369 ، الأم للإمام الشافعي ص84 .الحاوي الكبير 8|145 ، الإنصاف للمرداوي 10| 339، المحلى 9|304.

82 ) البحر الرائق 5|143 . الإستنكار 5|369 .

83 ) واتە ئەبو یوسف و موحەممەد .

هەڵگەڕانەوە بۆ میراتگرەکانیەتی، چونکە هەروەکو مردوو دادەنرێت لە سامانیەتی دەرناچێت[84] .

بەڕاستی ئەم بۆچوونەی دوایی لە گشتیان پەسند ترە؛ چونکە ئەمە بۆچوونی صەحابە بەرزەکان و تابعینەکانە، ئەوانیش بۆچوونیان لەپێشترە لە کەسانی دوای ئەوان؛ لەبەر ئەوەی ئەمە بە ئەقل نازاندرێ لەوانەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەریان گرتبێ .

لە لایەکی ترەوە لە گشت حوکمەکانی کەسایەتی لە ئیسلامدا هەر خزمی میراتگر بۆ میرات گرتن لە دەولەت لە پێشترە .

**ڕێگری چوارەم: کۆیلەیی(الرق)**[85]: زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی کە کۆیلە میرات ناگرێت؛ چونکە شایستەیی خاوەنداریەتی نیە ، لەبەر ئەوەی خۆی سامانی خەڵکە وماڵەکەشی دەبێتە ماڵی گەورەکەی و بۆ ئەو نابێت[86] .

**ـ جیاوازی وڵات یا ڕەگەز (إختلاف الدار أو الجنسيه)**: ئەمە لە شەریعەتی ئیسلامدا نیە، بۆیە ژمارەی ڕێگرەکانم بۆ دانەنا، چونکە موسوڵمان لە کوێ بێ ئەوێ وڵاتیەتی، ڕەگەزنامەی هەمو موسوڵمانەکان هەر ئیسلامە، بۆیە موسوڵمان میرات لە میراتلێگیراوی خۆی دەگرێ لە هەر وڵاتێکدا بژییێت هەر چ ڕەگەزنامەییکی هەبێت،

---

84 ) المحلى 9|305 ، الحاوي الكبير 8|145 .

85 ) ئێستا نوسەرەکانی ئەم سەردەمە وایان پێ باشە باسی کۆیلەیی نەکەن لەبەر ئەوەی نەماوە و کاری پێ ناکرێ ، بەڵام من هەر لەبەر پاراستنی ئەمانەتی زانستی باسم کردووە دەبێ هەبێ نەبادا ئەم دیاردەیە لە زەمانێکا بگەڕێتەوە دەبێ حوکمەکەی دیار بێ تا کاری بکرێ.

86 ) شرح السراجية في علم الفرائض ص8 ، شرح مختصر خليل 8|122 ، كفاية الأخيار 1|328 ، الروض المربع 3|50 .

لە وڵاتی ئیسلامان بێ یا هی کافران، واتە جیاوازی وڵات و ڕەگەزنامە لە شەریعەتی ئیسلامدا نابێتە ڕێگر لە میراتگرتن ... لە یاسای عیراقیشدا بە زەقی باسی نەکراوە بەڵام لە باسی وەسیەتا ماددەی (71) دەڵێ: {وەسیەت تەنیا لە عەقار دروستە لەگەڵ جیاوازی ئایین، وە وەسیەتی پێ دروستە لەگەڵ جیاوازی ڕەگەزنامە، بەمەرجی مامەڵەی بەرامبەری وەکویەك}[87] . لەسەر ئەمە وا ئەنجامدراوە کە: بێگانەکان لە عیراقیەکان میرات ناگرن تەنیا ئەگەر دەوڵەتی ئەوان میرات بە عیراقی بدات[88] .

## { باسی دەیەم }

## ﴿ چۆنیەتی دانانی مەسەلەی میرات و بنچینەی و دابەشکردن ﴾

ئەگەر یەکێك بمرێت و میراتگری هەبێ ماڵ و سامانی لەپاش بەجێمابێ ، پێویستە میراتگرەکان دیار بکرێن ، بۆ ئەوەی میراتەکەیان بەسەردا دابەش بکرێ .

وەك کابرایێك مردبێ و میرات گرەکانی باوك و دایکی و دوو کچی بن ، کەسی تریان لەگەڵدا نەبێ ، باوك و دایکەکە هەریەکە شەشێکیان دەدرێتی و دوو کچەکەش دوو سێیەك بە پێی فەرموودەی قورئان، بەڵام زێدە دەمێنێتەوەو دەدرێتە باوکەکە لەگەڵ شەشیەکەکەی کۆ دەبێتەوە ، جا بۆ ئەم مەبەستە مەسەلەیێکی بیرکاریان بۆ

87 ) قانون الأحوال الشخصية وتعديلاته مع قرارات مجلس قيادة الثورة رقم 188 لسنة 1959م ط5 بغداد .

88 ) أحكام الميراث والوصية للدكتور مصطفى الزلمي ص23 .

ڕێك دەخەین هەتا بگەینە ئەنجامی دیار کردنی بەشەکانی میراتگرەگان و هەر کەسە بەشی خۆی پێ بدەین ، مسەلەکەش بەم جۆرە دەبێت:

1ـ میراتگرەکان لەسەرەوە دادەنێین هێلیان لە ژێرا دەکێشین .

2ـ فەرزەکانیان لەبنەومیان لە ژێر هێلەکە دەنووسین ، فەرزەکان بە شێوەی کەرت دەنووسرێ .

3ـ بنچینەی مەسەلەکە کە بە عەرەبی پێی دەوترێ (اصل المسألە) دیار دەکرێ کە بریتیە لە بچوکترین چەندجارەی هاوبەشی ژمارەکانی ژێری کەرتەکان، وەك (6) ژمارەی هاوبەشی( 2 و 3) یە ، بەسەر هەردووکیان دابەش دەکرێ بەبێ مانەوە .

4 ـ بەشەکانیان دەردەکەوێ بە پێی دابەش کردنی بنچینە لەسەر ژێری کەرتەکان، هەر کەسە بەشی خۆی لە ژێر کەرتەکەی دەنووسرێ . بۆیە دەبێ کۆی بەشەکان یەکسان بێت لەگەڵ ژمارەی بنچینە. چونکە بنچینە بریتیە لە ژمارەی هاوبەشی نێوان ژێری کەرتەکان، دەبێ بەسەر گشتیاندا دابەش بکرێت بەبێ مانەوە ، بەم جۆرەی خوارەوە :

| میراتکرەکان : | باوك | دایك | 2کچ | بنچینەی مەسەلە |
|---|---|---|---|---|
| فەرزەکان | $\frac{1}{6}$ + پاشماوە | $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | 6 |
| بەشەکان : | 1 + 2 + | 1 + | 2 = | ↖ |
| | فەرز ↓ تەعصیب ↙ | | | |

لێرەدا فەرزی باوك شەشێكە هی دایكیش هەر شەشێكە هی دووكچەكە دوو سێیەكە، لەسەر ئەمە دایك و باوك هەر یەكە بەشێكیان بەركەوت و كچەكەش دوو بەش، كۆیان بوە (4)، واتە لە شەشەكە (2) دەمێنێتەوە، ئەویش هەر دەدرێتەوە باوك لەگەڵ فەرزەكەی كۆ دەبێتەوە، واتە سێ بەش دەبات بە فەرزو بە تەعصیب، واتە بە بەشی دیاركراوی خۆی و بە ڕەگەزیەتی، چونكە باوك (عصبە)یە واتە ڕەگەزیە یا خزمی پشتە ، پاش ئەوە كۆی بەشەكان دەكاتەوە(6)كە بنچینەی مەسەلەكەیە .

بەم جۆرە مەسەلەكە تەواو بوو ، جا مالەكە یا پارەكە دابەش دەكەینە سەر شەش بەش و لە بەشەكانیان دەدەین ، هەر كەسە بەشی خۆی وەردەگرێ وەك لەمەو دوا بە درێژی ڕوون دەبێتەوە..

## بنچینەی مەسەلەكان وچۆنیەتی دابەشكردن :

وەك لە لەپێشەوە دەركەوت ، بنچبنەی مەسەلەكان بە گوێرەی ئەم ڕێسایانەی خوارەومیە:

1. ئەگەر یەك خاوەن بەشی تیادا بوو ژێری كەرتی بەشەكەی دەبێتە بنچینەی مەسەلەكە.وەك ژنێك لەگەڵ برا كە ژنەكە چارەگێك دەبا بنچینەی مەسەلەكە چوارە.

2. ئەگەر میراتگرەكان لەیەك خاوەن بەشیان پتر تیادا بوو بنچینەی مەسەلەكەیان بریتی دەبێ لە ژمارەی هاوبەشی ژێرەكانی كەرتەكان .وەك: مێرد 1|4 دایك1|6 باوك1|6 كوڕ پاشماوە. لێرەدا بنچینەی مەسەلە (12)یە كە بریتیە لە ژمارەی هاوبەشی نێوان( 4 و 6) .

3ـ ئەگەر میراتگرەکان وەکویەك بوون و یەك چین بوون ، بنچینەکە بریتی دەبێ لە ژمارەی میرات گرەکان ، و میراتەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێت بە عەصەبە، وەك پێنج کوڕ بنچینەکەیان پێنجە. یاشەش، برای لە دایك باوك بنچینەکەیان شەشە . بەهەمان شێوە ئەگەر میراتگرەکان بە بە فەرزو بە ڕەد هەموو میراتەکە ببەن وەك چوار کچ یا سێ خوشك یا چوار کچی کوڕ.

4 ـ ئەگەر میراتگرەکان نێرو مێ پێکەوە بوون و لەیەك چین دا بوون بنچینەکە بریتی دەبێ لە ئەنجامی ژمارەی نێرەکان، لەدوو بدرێت و لەگەڵ ژمارەی مێیەکان کۆ ببێتەوە . وەك: سێ کورو دووکچ ، بنچینەی مەسەلەکەیان هەشتە ، میراتەکە دابەش دەکرێتە هەشت، بۆ هەر کوڕێك دووبەش و بۆ هەرکچێك یەك بەش ، یاسێ براو سێ خوشك بنچینەکەیان نۆیە .

ئەوەی کە پێویستە بزانرێ بنچینەکانی مەسەلەکان گشتیان حەوتن کە ئەمانەن: ( 2 ، 3 ، 4 ،6، 8 ، 12، 24) . واتە هیچ بنچینەیەك لەیەك لەو ژمارانە دەرناچێت.

هەندێك لەم بنچینانە هەندێجار زیاد دەکاو پێی دەووترێ (عەول) واتە سەرکوتن. هەندێجار کەم دەکات و پێی دەووترێ (ڕەد)، واتە گەڕاندنەوە. هەندی جاریش هەندی لەبەشەکان قەبوڵی دابەشکردن ناکا بەسەر ژمارەی میراتگرەکانا پێویستی بە گونجاندن هەیە کە پێی دەووترێ (تەصحیح)، واتە ڕاست کردنەوە، وەك لە لەدواییدا دەردەکەوێ .

**<u>تێبینی</u>**: 1ـ هەروەکو دیار کرا کۆی بەشەکانی میراتگران بە عەرەبی پێی دەڵێن ( أصل المسألة ) واتە بنچینەی مەسەلە. بەشی دیارکراوی بە دەقی قورئان پێی دەڵێن (فرض) واتە پێویست کراو ، بەڵام لە مەسەلەکاندا وشەی (فەرز)مان بەکار هێنا

چونكە سوكترە لە وەرگێرانی بۆ كوردی ، ئەو بەشەش كە بە پێی دامەزراندی مەسەلەكە بەر میراتگر دەكەوێ پێی دەووترێ (سهم) ناومان نا بەش .

وەك دیار كرا هەندێ میراتگر بە (فەرز) واتە بەشی دیار كراو میرات دەبەن و هەندێكی تر بە (عصبە)واتە ڕەگەزی یا پشت، بەلاّم هەندێ مێراتگر لە هەندێ حالّەتا بە هەردوولا میرات دەبەن ، واتە بە فەرزو بە تەعصیب ، هەر بە زاراوە عەرەبیەكەی لە مەسەلەكاندا ئاماژەمان پێدا لەبەر ئەوەی كردنە كوردی دەقاودەق زەحمەتە . وام پێ باش بوو وەكو دەستەواژە هەر وەكو خۆی بەكار بێت.

2ـ لە مەسەلەكاندا هەركە دەلێین دایك یا باوك یا كچ یا كوڕ یا ژن یا مێرد یا هی تر لە خزمەكان مەبەست دایك و باوك و كچ و كوڕ و مێرد یا ژنی مردوومەكەیە[(89)] كە مال و سامانی لە پاش بەجێماوەو ئەمانە لە ژیاندان و میراتی لێ دەگرن . ئەگەر ژن لەگەلّ میراتگراندا بوو واتە مێرد مردووە ئەگەر مێرد لەگەلّدا بوو واتە ژن مردووە.

89 ) ئەگەر مردوەكە پیاو بێ ژنی لەپاش بەجێ دەمێنی بۆ میرات گرتن ئەگەر ژنیش بێ مێردی لەپاش دەمێنێ و میراتی لێ دەگرێ .

# { بەشی دووەم }

## ﴿ میراتی خاوەن بەشە دیارکراوەکان ﴾

## (( میراث أصحاب الفروض ))

لەم بەشەدا باسی میراتی خاوەن بەشە دیارکراوەکان (أصحاب الفروض ) دەکەین هەر یەکە لە باسێکی تایبەتی خۆی ، بەم جۆرەی کە دێ ...

## { باسی یەکەم }

### ﴿ بەشی مێرد و ژن ﴾

خوای مەزن لە سوڕەی نیسادا دەفەرموێ:( وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ......(12)) .

واتە نیوەی ئەوەی ژنەکانتان بەجێیان هێشتووە بۆ ئێوەیە ئەگەر منالْیان نەبوو ، بەلاّم ئەگەر منالْیان هەبوو چارێکی میراتەکەیان بۆ ئێوەیە پاش پێدانی وصیەتێکی کە وەسیەتیان پێ کردووە یاپاش دانەوەی قەرزیان کە لە لەسەرە، وە چارێکی ئەوەی بەجێتان هێشتووە بۆ ژنەکانتانە ئەگەر مندالْتان نەبوو، بەلاّم ئەگەر مندالْتان هەبوو هەشتێکی ئەوەی بەجێتان هێشتووە بۆ ئەوانە. ڕوون کردنەوەی ئەوەش بەم جۆرەیە:

## یەکەم : ( میراتی مێرد )

بە پێی ئایەتەکە میراتگرتنی مێرد بەهۆی هاوسەری دوو باری هەیە:

**باری یەکەم:** نیوەی میراتەکە دەبات لە ژنە مردووەکەی ئەگەر ژنەکە لقی میراتگری نەبێ (کورو کچی یا کورو کچی کوری و بەرەو خوار ) لەو مێردە بن یا لە مێردێکی تر بن .

بۆ نمونە : ژنێك مرد، مێردو برایەکی لە دایك و باوکی(شقیق) خۆی میراتگر بوون ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:

| میراتگرەکان: | مێرد | برای لە دایك و باوك | بنچینەی مەسەلەکە |
| --- | --- | --- | --- |
| فەرزەکان: | $\frac{1}{2}$ | (پ) پاشماوە | (2) |
| بەشەکان: | 1 | + 1 | = |

لێرەدا مێردەکە بەشی دیارکراوی نیوەیە برای لە دایك و باوك ڕەگەزیە (عصبە) پاشماوەکە دەبات، ماڵەکە بە پێی بنچینەکەی مەسەلە دوو بەشە، نیوەی بۆ

مێردەکە ، پاشماوەکەش کە نیوەی ترە بۆ براکە، واتە دەکرێتە دوو بەش هەر یەکە بەشێك دەبات.

ئەگەر وا دابنێین میراتەکە بایی بیست ملیۆن دیناربێت، دابەش دوو دەکرێت کە بنچینەی مەسەلەکەیە ، (10) ملیۆن بۆ مێردەکەی و (10) ملیۆنیش بۆ براکەی .

**باری دووەم:** مێرد چارێکی میراتەکەی ژنی دەبات ئەگەر ژنەکە لقی میراتگری هەبێ لەئەو یا لە مێردێکی تر . بۆ نمونە ژنێك مرد میراتگرەکانی مێردو و کوڕێکی خۆی بون ، میراتەکە بەم جۆرەیە:

| میراتگرەکان: ← | مێرد | کوڕ | بنچینەی مەسەلەکە |
| --- | --- | --- | --- |
| فەرزەکان: ← | $\frac{1}{4}$ | (پ)پاشماوە | (4) |
| بەشەکان: ← | 1 + | 3 | = |

ئەلێرە میراتەکە بوە چوار بەش ، یەکێکیان بۆ مێردەکە ، سێ بەشیشیان بۆ کوڕی ژنەکە .

## باریکی تایبەتی:

1. ئەگەر پیاوەکە ئامۆزای ژنەکە بوو ژنەکەش کەسی لەو نزیکتر نەبوو ، لێرەدا لای زۆربەی زانایان پیاوەکە بەدوو لایەن میرات دەبا، لایەنی مێردایەتی و لایەنی ئامۆزایەتی، واتە بە خاوەن بەشی و بە ڕەگەزایەتی، واتە بە خزمایەتی پشت

(عەصەبە) . لای هەندێ زانایانی تر پاشماوەکە دەبات بە گەڕاندنەوە بۆ بەسەر بەشەکەی خۆی .

2. ئەگەر مەسەلەیەك بارنج بووی تیادا بوو بارنجبوەکە هیچی بۆ دانانرێو بێ بەش دەبێت وەك:

وەك ژنێك بمرێ میراتگرەکانی مێردوو کوڕێك و کچێك و براکەی بن ، میراتەکە بەم جۆرەیە :

| میراتگرەکان: | مێرد | کوڕ | کچ | بـرا | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|---|---|---|
| فەرزەکان | $\frac{1}{4}$ | پاشماوە(3) | | بارنجە | (4) |
| بەشەکان | 1 + | 2 + | 1 + | هیچ = | |

لێرەدا بینیمان براکە هیچی بەرنەکەوت چونکە بارنجە .

## ( دووەم : میراتی ژن )

ئەگەر پیاو مردو ژنی لە پاش بەجێما ، ژنێك بوو یادوو یاسێ یاچوار دوو حالەتیان هەیە هەر حالەتە ڕێسای خۆی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** چارێگیکی میراتەکە بۆژنە یەکیك بوو یاپتر، ئەگەر پیاوەکە لقی میراتگری نەبوو نە لە ژنە میراتگرەکەی نە لە هی تر . بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك مرد میراتگرەکانی ژنەکەی و برایێکی خۆی بوو، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| میراتگرەکان: ⟵ | ژن | برا | بنچینە |
| فەرزەکان: ⟵ | $\frac{1}{4}$ | (پ) پاشماوە | (4) |
| بەشەکان: ⟵ | 1 | + 3 | = |

ژنەکە بەشێکی برد و برای پیاوەکەش کە ڕەگەزیە پاشماوەکەی برد کە سێ بەشە. لێرەدا ئەگەر لەیەك ژن زیاتر با بەشەکەیان واتە چارێگەکەیان بەیەکسانی لە نێواندا دابەش دەکرا .

**حالەتی دووەم:** ژن هەشتێکی میرات دەبا ئەگەر پیاوەکە لقی میراتگری هەبێت چ لەو ژنە یا لە ژنێکی تر کە میراتگر نیە. بۆ نموونە: ئەگەر پیاوێك مرد میراتگرەکانی ژنی و کوڕێك بوون ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| میراتگرەکان: ⟵ | ژن | کوڕ | بنچینە |
| فەرزەکان: ⟵ | $\frac{1}{8}$ | (پ) پاشماوە | ( 8 ) |
| بەشەکان: ⟵ | 1 | + 7 | = |

ژنەکە هەشتێکی برد کە دەکاتە بەشێك. حەوت بەشیش بۆ کوڕەکە ماوە ، چونکە ڕەگەزیە واتە (عصبە)یە . ئەگەر وا دابنێن میراتەکە بایی (32) ملیۆن دینار بوو، دابەش 8 دەکرێ هەر بەشی دەکاتە چوار ملیۆن ، واتە ژنەکە چوار ملیۆن دەبات و کوڕەکەش کە حەوت بەشی هەیە لە چواری دەدەین دەکاتە بیست و هەشت ملیۆن دیناری بەر دەکەوێ .

لێرەدا ئەگەر ژمارەی ژن لەیەك پتر با واتە دووبان یا سێ یاچوار ! هەر تەنیا هەشتێیەکەیان دەبرد لە نێوانیانا بە یەکسانی دابەش دەکرا. وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| میراتگرەکان: ← | 4 ژن | کوڕی کوڕ | بنچینە |
| فەرزەکان: ← | $\frac{1}{8}$ | (پ) | (8) |
| بەشەکان: ← | 1 + | 7 = | |

یەك بەشەکە کە دەکاتە هەشتێك لە نیوان هەر چوار ژنەکە بە یەکسانی دابەش دەکرێ. چونکە ژن بە زۆری ژمارەیان بەشیان ناگۆڕێ ، گشتیان بەشدارن لە هەشتێکەکە ئەگەر منالی هەبوو ، یا چارێگەکە ئەگەر منالی نەبوو .

# { باسی دووەم }

## ﴿ بەشی میراتی باوك و دایك ﴾

خوا لە سورەی نیسادا دەفەرموێ :( وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (11)) .

واتە باوك و دایك هەریەكە شەشێكیان هەیە لە بەجێماوەكە ئەگەر منالّی هەبوو ، ئەگەریش منالّی نەبوو دایك و باوك میراتیان لێ دەگرت سییەك بۆ دایكیەتی، ئەگەر برای هەبوون شەشێك بۆ دایكی پاش وەسیەتێكی وەسیەتی پێدەكا یا قەرزێكی كە لە سەریەتی ، باوكانتان و منالآنتان نازانن كامیان بۆ ئێوە بەكەلك ترە ، ئەمە دانانی خوایەو خوا زاناو حەكیمە .

كەوابوو بە گوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دایك و باوك هەر یەكە چەند حالەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی میرات لە منالەكانیانا بگرن .

## یەكەم: ( میراتی باوك )

### چۆنیەتی میراتگرتنی باوك:

ئەگەر مردوەكە لقی واتە منالّی میراتگری هەبوو، باوكی بەگوێرەی ئەم حالەتانەی خوارەوە میراتی لێ دەگرێ.

**حاڵەتی یەکەم:** باوکی شەشێکی میرات دەبا ئەگەر مردووەکە لقی میراتگری هەبێ(واتە کور یا کوری کور و بەرەو خوار ). بۆ نموونە: یەکیك مردو میراتگرەکانی تەنیا باوکی و کوڕی بوون، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| میراتگرەکان: | باوك | کوڕ( یا کوڕی کور ) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| فەرزەکان: | $\frac{1}{6}$ | ( پاشماوە ) | (6) |
| بەشەکان: | 1 | + 5 = | |

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر مردووەکە لقی میراتگری نەبوو و هیچ میراتگری تریشی نەبوو جگە لە باوکی ، لێرەدا باوکی هەموو میراتەکە دەبا ، یا خزمێکی تری هەبێ کە لەگەڵ باوك میرات ناگرێ . وەك:

| باوك | ئاموزایەك | باوك | برای دایکو باوکی(شقیق) |
|---|---|---|---|
| هەموو | (بارنجە) هیچ نابا | هەموو | (بارنجە) هیچ نابا |

لێرەدا باوك هەموو ماڵەکەی دەبا ئامۆزاکە یا برای دایکو باوکی هیچیان پێ نابڕێ چونکە بەباوك (حەجب) واتە بارنج دەبن .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر مناڵە مردووەکە لقی میراتگری نەبوو بەڵام میراتگری تری هەبوو لێرەدا باوك پاشماوەی (باقی) میراتەکە دەبات چونکە دەبێتە عەصەبە .

نموونە : یەکێك مرد ژنەکەی و باوکی میراتگری بوون ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە .

| میراتگرەكان : ← ژن | باوك | بنچینە ی مەسەلەكە |
|---|---|---|
| فەرزەكان: ← $\frac{1}{4}$ | (پ) پاشماوە | (4) |
| بەشەكان: ← 1 + | 3 | = ↖ |

ژنەكە بەشێكی برد پاشماوەكەشی كە 3 بەش بوو بۆ باوك ماوە چونكە (عصبە) ڕەگەزییە .

**حالەتی چوارەم:** ئەگەر باوك لقی میراتگری مێی لەگەڵ بوو وەك كچ یا كچی كچ ، باوك لێرە دەبێتە عەصەبە جگە لە شەشێكی خۆی پاشماوەكەش دەبا پاش میراتی كچ، شەشێكەكە بە فەرزو پاشماوەكەش بە تەعصیب. چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ) واتە بەشەدیاركراوەكان بدەنەوە خاوەنەكانیان و ئەوەی ماوە با بۆ نزیك ترین مرۆڤی نێر بێت ، وەك ئەم نمونەیە:

| میراتگرەكان: ← 2كچ | باوك | بنچینەی مەسەلە |
|---|---|---|
| فەرزەكان: ← $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ بە فەرز | (6) |
| بەشەكان: ← 4 + | 2(1 بەفەرز + 1بە تەعصیب)= | ↖ |

ئە لێرە یەك بەش دەمێنێتەوە ئەویش هەر بۆ باوكەكەیە چونكە عەصەبەیە .

كەوابوو باوك لێرە (2)دوو بەش دەبات. ئەمە لای (جمهور) واتە زۆربەی زانایان.

ـ لای جەعفەریەکان کچ وەکو کوڕ دەژمێردرێ پاشماوەی میراتەکە دەبات پاش شەشێکی باوك. ئەمە ئەگەر کچی مردووەکە بوو یا کچی کوڕی بوو ، بەلام ئەگەر کچی کچ بوو وەکو دایکی خۆی میرات لەگەڵ باوکەکە دەگرێ، هەروەها کوڕی کچیش بەم جۆرە و پاشماوەکەشی بە ڕێژەی فەڕزەکانیان دەگەڕێتەوە سەر هەردوولا ...

ـ لە یاساشدا باوك لەگەڵ کچ تەنیا شەشێك دەبات چ یەك بوو یادوو پاشماوەکەشی بۆ کچە، یەك بێ یازیاتر بە فەرزو بەڕەد . بەگوێرەی برگەی(2) لە مادەی (91)ی هەموارکراو کراو .

بەلام لیرەدا بۆچوونی زۆربەی زانایان ڕاستە چونکە کچ لە گەڵ باوك نابێتە عەصەبە بەڵکو لەگەڵ کوڕ، واتە براکەی دەبێتە عەصەبە. باوك جگە لە خاوەن فەڕزی لە گەڵ نێرینە، بەتەنیا (عەصەبەیە)و پاشماوەش بەئیجماعی زانایان هەر بۆ عەصەبەیە .

## بەهێزی میراتگرتنی باوك:

1ـ باوکی مردوو بەهیچ میراتگرێك بارنج (حەجب) نابێت کە بێبەشی بکات لە میرات. بەلام منالەکانی مردوو و نەوە نێرینەکانی بەشی کەم دەکەنەوە بۆ شەشێك.

2ـ بە ئیجماعی زاناکان هیچ کەسیك لەگەڵ باوك میرات ناگرێت تەنیا کوڕەکانی مردوو یا کوڕی کوڕی و یا ژنی یا مێردی هەروەها دایکی مردوو و دایکی دایکی لە گەڵیا میرات دەگرن .

ـ تەنیا لای جەعفەریەکان دایکی دایکی مردوو میرات نابا لەگەل باوك؛ چونکە لە پلەی دووەمە و باوك پلەی یەکەمە[90] .

## دووەم: ( میراتی دایك )

میـرات گرتنی دایك لە منالّی خۆی سێ حالەتی هەیە:

**حالەتی یەکەم** : دایك سییەکی میرات دەبات بەم مەرجانەی خوارەوە :

1ـ منالّە مردووەکە هیچ لقی میراتگری نەبێت نەنێر نەمێ .

2ـ مردووەکە هیچ براو خوشکی نەبێت .

3ـ مردووەکە ژن یا مێردی نەبێ لەگەڵ باوکیا میرات بگرن .

| میرات گرەکان : | دایك | باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| فەرزەکان: | $\frac{1}{3}$ | پاشماوە | (3) |
| بەشەکان: | 1 | + 2 = | ← |

ـ میراتەکە دەکرێتە سێ بەش یەکێکیان بۆ دایك و دوویان بۆ باوك .

90 ) أحكام الميراث والوصية ، د. مصطفى الزلمي ص38 .

**حاڵەتی دووەم: ئەمەش دوو شێوەیە:**

**1ـ شەشێکی میرات دەبات ئەگەر مردووەکە لقی میراتگری هەبوو نێر بێ یا مێ .**

**نموونە : یەکێك مرد میراتگرەکانی دایکی و کوڕی و یاکوڕی کوڕی بوون ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:**

| دایك | | کوڕ ( یا کوڕی کوڕ) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | | پاشماوە | (6) |
| 1 | + | 5 | = |

**کەواتە دایك یەك بەش دەبات و کوڕیش یا کوڕی کوڕ شەش بەش دەبات .**

**2ـ ئەگەر ژمارەیەك لە براو خوشکی لەگەڵ بوون ئەوان هیچیان بەرناکەوی بەڵام دایك هەر شەشێك دەبات . واتە براو خوشك بە باوك بارنجن میرات ناگرن ، بەڵام بەشی دایك لە سێیەك کەم دەکەنەوە بۆ شەشێك .**

**نمونە : یەکێك مرد لە دایك و باوك و سێ برا ، میراتەکەی بەم جورەیە:**

| دایك | | باوك | | 3 برا | بنچینە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | | پاشماوە | | ( بارنجن بە باوك ) | (6) |
| 1 | + | 5 | + | هیچ | = |

واتە بەشێك بۆ دایك و پێنج بەشیش بۆ باوك براكانیش هیچیان نەبرد بەلاّم ڕێژەی میراتی دایكیان كەم كردەوە لە سێیەك بۆ شەشێك .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر دایك و باوك و ژن و یا مێرد پێكەوە بوون ، دایك سێیەكی پاشماوە دەبات پاش بەشی ژنەكە یا مێردەكە . بەم مەرجانەی خوارەوە :

1- مردووەكە لقی میراتگری نەبێت نە نێر نە مێ .

2- هیچ خوشك و برای لە دایك و باوكا یا تەنیا لە دایكا یا لە باوكا نەبێت .

3- لەگەڵ باوكا ژنەكەی مردوو یا مێردەكەی یەكێكیان كۆ بێتەوە .

**نمونە** : ژنێك مرد میراتگرەكانی دایك و باوك و میردی بوون ، میراتەكەی بەم جۆرەیە:

| مێرد | دایك | باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | پاشماوە | (6) |
| 3 + | 2 + | 1 = | |

لێرەدا باوك تەنیا یەك بەشی بەركەوت بەلاّم دایك دووی بەركەوت ، ئەمەش نابێ چونكە پێچەوانەی ئایەتی: (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ)ـە دەبێ بیگۆڕین، بۆیە پاشماوەی دوای بەشی مێرد كە سێیە دوو بەشی دەدەینە باوك و بەشێكی دەدەینە دایك بۆ بەجێ هێنانی دەقی ئایەتەكە . بەم جۆرە:

نمونە(1): **میرد** **دایك** **باوك**

3 1 2

لێرەدا بە گوێرەی ئایەتی پیرۆز دایك بەشێکی برد و باوك دووبەش و ڕێسای ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ هاتە جێ ! .

نمونە(2):

| ژن | دایك | باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{3}$ | (پ) | (12) |
| 3 + | 4 + | = 5 | |

لێرەدا بۆ ئەوەی دەقی ئایەت بێتە جێ ، چواربەشەکەی دایك و پێنج بەشەکەی باوك کۆ دەکەینەوە دەبێتە (9) کە پاشماوەیە پاش بەشی ژنەکە لە (12) ، جا لەم نۆیە (3) بەش دەدەین بەدایك و (6) بەش دەدەین بەباوك ، بۆ ئەوەی باوك دوو ئەوەندەی دایك وەربگرێ لەسەر بنەمای ئایەتەکە .

**بۆچوونێکی تر:** عبد الله ی کوڕی عەباس ﷺ و زاهیریەکان و جەعفەریەکان ڕایان وایە لەم مەسەلەیەدا گۆڕانکاری نەکرێ ، واتە دایك هەر سێیەکەی خۆی پێ بدرێت با لە بەشی باوکیش زیاتر بێت ، هەتا ڕێك بکەوێ لەگەڵ دەقی ئایەتی سەرەوە .

## بەهێزی مراتگرتنی دایك:

1ـ بە ( ئیجماعی )[91] واتە کۆی زانایان دایك بە هیچ میراتگرێك بارنجی تەواو نابێت بەشێوەیێکی وا هیچ ومرنەگرێت .

2ـ لای زۆربەی زاناکان هەموو خزمەکانی زگ (ذوي الأرحام) بارنـج دەکات .

3ـ خزمی پشت (عصبە) واتە ڕەگەزیەکان هیچیان بارنـج (حەجب) ناکات .

4 ـ بارنجی دایکی دایك و دایکی باوك دەکات .

ـ لای جەعفەریەکان بارنجی هەر میراتگرێك دەکات کە لە پلەی دوو یا سێ دا بێت. چونکە دایك لە پلەی یەکەمە .

91) ئیجماع واتە زانیانی ئیسلام هەمویان یەك قسەن واتە کۆکن لە سەر حوکمێك .

# { باسی سێیەم }

## ﴿ بەشی کچ و کچی کوڕ ﴾

خوای گەورە لەسورەی نیسادا فەرموویەتی:(يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ) . . .((11)).

واتە خوا پێتان ڕادەگەیێنی لە میراتگرتنی منالەکانتان بۆ نێرینە شێوەی بەشی دوو مێینەیە، ئەگەر ژنەکان(مێینەکان) دووو پتر لە دوو بوون دوو سێیەك لە بەجێماوەکە بۆ ئەوانە، ئەگەریش یەك بوو نیوەی بۆ ئەوە .

بە گوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کچ و کچی کور هەر یەکە چەند حالەتی خۆی هەیە ، لە هەندێ حالەتا وەکو یەکن و لەهەندێکی ترا جیاوازن .

### یەکەم: بەشی کچ

میراتی کچ لە دایکی بگری یا لە باوکی چوار حالەتی هەیە :

**حاڵەتی یەکەم :** ئەگەر یەك کچ بوو نیوەی میرات دەبات بە مەرجێ کوڕی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێت .

بۆ نمونە: ژنێك مرد لە کچی و مێردەکەی و دایکو باوکی، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| کچ | مێرد | دایك | باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (12) |

6 + 3 + 2 + 2 = بنچینەکە بەرز بووەوە بۆ (13)[92]

92) بەرز بوونەوەی کۆی بەشەکان بە عەرەبی پێی دەڵێن (عول) .

کەوابوو لەسەر بنچینەی (13) دەڕۆین، واتە ماڵەکە دابەشی (13) بەش دەکەین لە جیاتی (12).

بۆ نمونە ئەگەر (260) ملیۆن دیناری لەپاش بەجێمابوو دابەشی (13)ی دەکەین هەر بەشێك (20) ملیۆنە . لە بەشەکانی میراتگران دەدەین بەم جۆرە: کچەکە:( 6×20=120) ملیۆن دەبات . و مێردەکەش (3×20=60) ملیۆن دەبات. ودایك (2×20=40) ملیۆن دەبات، وباوکیش(2×20=40) ملیۆن دەبات. کۆی گشتیان کە دەکاتەوە (260)ملیۆن، دیار دەکات کە مەسەلەکە ڕاستە.

**حاڵەتی دووەم** : ئەگەر ژمارەی کچ لە یەك زیاتر بوون، واتە دوو بوون یا پتر دوو سێیەکی ماڵەکە دەبەن ، بەمەرجێ هیچ کوڕی مردوویان لەگەڵدا نەبێت .

نموونە : یەکێك مرد لە دووکچ و دایکی و باوکی ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| بنچینە | باوك | دایك | 2کچ |
| --- | --- | --- | --- |
| (6) | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ |
| = | 1 + | 1 + | 4 |

کچەکان چوار بەش دەبەن هەریەکیان دوو بەش ، دایك و باوکیش هەر یەکە یەك بەش دەبەن .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر مردووەکە کچ و کوڕی پێکەوە هەبوو، ژمارەیان هەرچەند بێ لە سەر ڕێسای ( **للذكر مثل حظّ الأنثيين**) میرات دەگرن ، واتە هەر کچە بەشێك و هەر کوڕە دووبەش.

**نموونە(1)**: ژنێك مرد لە مێردو کچ و کوڕێك ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:




لیرەدا مێرد بەشیکی خۆی برد لە چوارەکە، پاشماوەکە کە سێ بەشە، یەکێك بۆ کچەکەو دوانی بۆ کوڕەکە لە سەر ڕێسای ئایەتی پیرۆز (**للذّكر مثل حظّ الأنثيين**) .

**نموونە(2)**: پیاوێك مرد لە ژنەکەی و (3) کوڕو کچێك ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:




لێرەدا ژنەکە بەشێکی خۆی برد لە هەشت ، پاشماوەکەی کە حەوتە ، بۆ هەر کوڕە دوو بەش بۆ کچەکەش بەشێك، کۆیان دەکاتە (7) .

- لێرەدا کچ لەگەڵ کوڕ بوو بەعەصەبە بەهۆی کوڕەکە ، کە پێی دەڵێن: (عصبە بالغیر) واتە عەصەبەیە بەهۆی هی تر .

**حالەتی چوارەم**: بەگوێرەی یاسا، مادەی(91) لە یاسای بارەکانی کەسایەتی بە پێی مادەی هەشتەم لە یاسای ژمارە (21) ساڵی 1987م لە هەموارکردنی دووەمی یاسای بارەکانی کەسایەتی ژمارە (188) سالی 1959م بەم جۆرەیە:

کچ یا کچەکان ئەگەر هیچ کوڕی مردووەکەیان لەگەڵدا نەبوو پاشماوەی خاوەن بەشە دیارکراوەکان دەبەن ، ئەگەر بەتەنیا بوون و هیچ میراتگریان لەگەڵدا نەبوو گشت ماڵەکە دەدرێ بەوان . ئەمەش پێچەوانەی ئیجماعی زانایانی ئیسلامە .

**نموونە:** یەکێك مرد لەباوك و کچێك ، میراتەکەی بە پێی یاسا بەم جۆرەیە:

| باوك | کچ | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | پاشماوەکە | (6) |
| 1 + | 5 (3بە بەشی دیار کراوی خۆی و 2بەگەڕانەوە بۆی)[93] | |

ئەمەش پێچەوانەی ئیجماعی زانایانی شریعەتە، چونکە بەگوێرەی شەریعەت پاشماوەکە دەگەڕێتەوە بۆ باوك بەم جۆرەی خوارەوە :

| باوك | کچ | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | (6) |
| ( 2+ 1) + | 3 = | ← |

لیرەدا باوك بەگوێرەی شەریعەت 3 بەش وەردەگرێت یەکێکیان بەفەرز دوانیشی بە عەصەبە، کچەکەش نیوەی خۆی دەبات کە دەکاتە سێ بەش .

93 ) ( فرضا وردا )

## بەهێزی میراتگرتنی کچ:

1ـ کچ بەهیچ میراتگرێك بارنجی (حەجب) تەواو نابێت کە بێ بەش بێت .

2ـ لای (جمهور) زۆربەی زانایان هەموو خزمەکانی خاوەن ڕەحم و خوشك و برای دایکی حەجب دەکات .

3ـ کچ ئەگەر دوو یا پتر بوون کچی کور حەجب دەکەن .

ـ لای جەعفەریەکان حەجبی منالی منالْ دەکات لەپلەی یەکەم ، هەروەها حەجبی هەمو میراتگرێك دەکات لە پلەی دوو و سێ .

ـ لە یاسادا هەموو میراتگرەکان حەجب دەکات تەنیا دایك و باوك و ژن و مێردو کوڕی مردوو نەبێ .

## دووەم: بەشی کچی کوڕ

کچی کوڕ چوار حالەتی هەیە :

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر تەنیا یەك کچی کور بوو، نیوەی میرات دەبا بەمەرجێ کوڕی مردووی لەگەڵدا نەبێ .

**نمونە:** یەکێك مرد لە کچیکی و میردی و دایکو باوکی ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:

| کچ | مێرد | دایك | باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (12) |
| 6 + | 3 + | 2 + | 2 = | بنچینەکە بەرز بوەوە بۆ (13) |

کەوابوو ماڵەکە ئەکەینە (13) بەش لەجیاتی (12) ، شەشی بۆ کچ، دووی بۆ مێرد، دووی بۆدایك ، دووی بۆ باوك ، هەمووی دەکاتە (13) .

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر دوو بوون یا پتر دوو سێیەکی میراتەکە دەبەن بە مەرجێ کوڕی مردووەکەیان لەگەڵدا نەبێ .

**نموونە:** یەکێك مرد لە دایك و باوکی و دوو کچی کوڕی، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| 2کچ | باوك | دایك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 4 + | 1 + | 1 = | |

لێرەدا کچی کور چوار بەش ئەبات باوك یەك بەش دایك یەك بەش .

**حاڵەتی سێیەم:** کچی کور ئەگەر کوڕی کوڕیان لەگەڵدا بوو ژمارەیان هەرچەند بێ لە سەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين ) میرات دەگرن ، واتە هەر کوڕە دووبەش و هەر کچە بەشێك.وەك:

نموونە(1): یەکێك مرد سێ کچ و چوار کوڕی هەبوو ، کوڕەکان هەشت بەش وەردەگرن هەر یەکە دوو بەش، کچەکانیش سێ هەریەکە یەك بەش. واتە مالەکە دەکرێتە یانزە بەش .

نمونە(2) : ژنێك مرد لە مێردی و کچی کوڕی و کوڕی کوڕی ، میراتەکەی بەم جۆرمیە :




لێرەدا مێرد بەشێکی وەرگرت لە چوار ، (3)ش ماوە بۆ کچو کوڕەکەی کوڕی ، کچەکە یەکیکی بەرکەوت و کورەکەش دوو بەپێی ئایەتب پیرۆز .

**حالەتی چوارەم:** کچی کوڕی مردوو یەك بوو یازیاتر ئەگەر لەگەڵ کچی مردوو کۆ بووەوە شەشێکی میرات دەگرێ وەکو تەواوکەری دوو سێیەك لەگەڵ پورەکەی، بەم مەرجانە:

1. کچکەی مردوو لە یەك پتر نەبێ . 2. کوڕی مردوو و کوڕی کوڕی مردووەکەی لەگەڵدا نەبێت.

نمونە: یەکێك مرد لە دایك و باوك و کچ و کچی کوڕ ، میراتەکەی بەم جۆرەیە .

| دایك | باوك | کچ | کچی کوڕ | بنچینەی مەسەلەکە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 1 + | 1 + | 3 + | 1 = | |

لێرەدا کچی مردوو نیوەی برد چونکە یەکە ، کچی کوڕ شەشێکی برد ، بە هەردووکیان بووە سێیەك . دایك و باوکیش هەریەکە بەشێکی برد ، هەمووی بوە شەش بەش، کە بنچینەی مەسەلەکەیە .

- منالی منال لە فیقهی جەعفەریدا جێی منالی مردوو دەگرێتەوە بۆ میرات گرتن، واتە منالی کوڕی مردوو بەشی میراتی باوکیان دەبەن ، منالی کچیش بەشی میراتی داکیان دەبەن ، نێر بن یامێ .

## بەهێزی میراتگرتنی کچی کوڕ:

1- بەشی باوك دایك کەم دەکاتەوە بۆ شەشێك و بەشی مێرد بۆ چارەگێك و بەشی ژن بۆ هەشتێك .

2- خزمەکانی خاوەن ڕەحم بەنێرو مێیەوە حەجب دەکات و بێ بەش دەبن .

3- ئەگەر کچی کوڕ لەیەك زیاتر بوون کچی کوڕی کوڕ حەجب دەکەن .

# { باسی چوارەم }

## ﴿ وەسیەتی پێویست (الوصیة الواجبة) ﴾

مەبەست لە وەسیەتی پیویست لێرە ئەوەیە کە بریتیە لە وەسیەت کردن بۆ خزمێك لە سنووری میراتگران دابێت بەڵام میرات ناگرێ لەبەر نەهێڵێك(مانع)، یا لە بەر بارنج کردنێك (حەجبێك) .

وەك پیاوێك چەند منالێکی هەبێ یەکێکیان پێشی خۆی بمری و منالێشی لە پاش بەجێ بمێنێ، پاشان باوکەکە بمرێ ، لیرەدا هەموو منالەکانی میراتی لێ دەگرن تەنیا ئەوەی پێشی ئەو مردووە ناگرێ ، چونکە یەك لە مەرجەکانی میراتگر ژیانیەتی، واتە دەبێ پاش میراتلێگیراوەکە لە ژیان دابێت، ئەویش لە ژیاندا نیە هەتا میرات بگرێ، منالەکانیشی بارنج(حەجب) دەبن بەمنالەکانی باوکی، واتە بە مامەکان و پلکەکانیان. بەڵام لەبەر بەزەیی هاتن بەو منالانە هەندێ لە یاساکان پێویستیان کردووە لە جیاتی میراتی باوکیان هەمان بەشی باوکیان بۆ بکرێتە وەسیەت لەگەڵ ئەوانی تر کە میراتگرن پێیان بدرێ، بە مەرجێ لە سێیەکی ماڵە بەجێماوەکە زیاتر نەبێ . چونکە وەسیەت لە سێیەکی ماڵ پتر دروست نیە بە دەقی حەدیسی پێغەمبەر ﷺ .

ئەم بۆچوونە یاسای مسری ژمارە (71) لەسالی 1946م دا وەری گرت . پاش ئەو یاساکانی ولاتە عەرەبیەکانیش کاریان پێ کرد . هەروەها لە هەموارکردنی سێیەمی یاسای باری کەسایەتی عیراقی ژمارە (72) لەسالی 1979م لەمادەی (74) ئەم ڕستەیەی زیاد کرد کە ئەمەش دەقەکەیەتی :

1ـ ئەگەر منداڵ پێشی باوکی مرد نێر بوو یامێ بە زیندوو دەژمێردرێ لەکاتی مردنی باوکی یا دایکی، و مافی میراتگرتنەکەی دەگوازرێتەوە بۆ منالەکانی ، نێر بن یا مێ ، بەگوێرەی حوکمەکانی شەرعی کە بە وەسیەتی واجبە دەژمێردرێ ، بەمەرجێ زیاتر نەبێ لە سێیەکی مالە بەجێماوەکە .

2ـ ئەم وەسیەتە بەپێی برگەی(1) لەم مادەیە بە پێش وەسیەتەکانی تر دەخرێ بۆ وەرگرتن لە سێیەکی ماڵی بەجێماو .

ـ جا بەپێی ئەم یاسایە هەرکەسێ کە دەزانێ منالی منالی میرات ناگرن لەبەر مردنی باوکیان پێشی باپیریان هۆی بارنج بوونیان بە منالەکانی خۆی ، پێویستە لەسەری ئەم وەسیەتەیان بۆ بکات ، ئەگەر نەشی کرد دادوەر (قازی) لەجیاتی ئەو ( میراتلێگیراوەکە) وەسیەتەکە جێبەجێ دەکات. وەسیەتەکەش بریتیە لە بەشی باوکیان یا دایکیان لە میراتەکە ئەگەر لەژیان دابا ، بە مەرجێ لە سێیەکی مالەکە پتر نەبێ .

**بەڵگەی شەرعی:** بەڵگەی ئەم بۆچوونە ئایەتی پیرۆزە کە لەسوورەی بەقەرەدا دەفەرموێ: ( كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ (180)).

واتە لەسەرتان نووسراوە ئەگەر یەکێکتان هۆیەکانی مردنی لێ ئامادەبوون وەسیەت بکا بۆ دایك و باوك و خزمەکانی بە چاکە و دادوەری بەشێوەیەکی وا زیان بە میراتگران نەگەیێنی. ئەمە مافێکی پێویستە لە سەر لەخوا ترسان[94] .

چەندین زانایان لە سەحابەو تابعینەکان وتوویانە ئەم وەسیەتە بۆ ئەم خزمانەیە کە میرات ناگرن[95]. هەروەها زانای زاهیری ئیبن و حەزم ئەم بۆچوونەی هەیە .

یاساییەکان ئەم بۆچوونەیان وەدەست گرتووە ، بۆ ئەوەی منالی منالٚ بێ بەش نەبن لە میرات، لەکاتێکا کە باوکیان پێشی باپیریان مردبێ .

لەسەر ئەمە بیرو بۆچوونە لە هەموار کردنی کوردستانی بۆ ماددەی بیست و چواری باری کەسایەتی عیراقیدا ئەم وەسیەتەی پێویست کردووە و کاری پێ کردووە. لەسەر هەمان بەڵگەکانی شەرعی و عەقلیەوە .

**نموونە(1):** یەکێك مرد لە دایکو باوکی وکچێکی و کوڕی کچێکی، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| دایك | باوك | کچ | کوڕی کچ | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | بارنجە | (6) |
| 1 + | ( 1+1 ) + | 3 + | 0 | = |



94 ) تفسير القرطبي 2\258 ، ابن كثير 1\212 ، تفسير البيضاوي 1\460 ،

95 ) تفسير ابن كثير 1\212 .

ئە لێرە چونکە باوك عەصەبەیە(ڕەگەزیە (2)بەش دەبا بە فەرزو بە تەعصیب.
کوڕی کچ بارنجە هیچ نابات ، بەڵام بەپێی وەسیەتی واجبە مەسەلەکەی بۆ دەگۆڕێ بەم جۆرەیەی دێ:

| دایك | باوك | كچ | كوڕی كچ | بنچینه |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $(\frac{2}{3})$ | | (6) |
| 1 + | 1 + | 4 = | | |

لیرەدا ئەگەرچی کوڕی کچ بارنجە بەڵام بە پێی وەسیەتەکە بەشی دایکی خۆی پێ دەدرێ، بویە لە گەڵ کچەکە، واتە پوورەکەی بەدوو کچ ژماردرا کە هەردووکیان دوو سێیەك دەبەن، کە کردیە چوار بەش، هەریەکە دوانیان بەردەکەوێ. بەشەکەی کە دووە لە سێیەکی ماڵەکە پتر نیە کە (6)ـە بۆیە وەسیەتەکە دروستە.

**نمونه(2):**

| ژن | 6كوڕ | كوڕی كوڕ | بنچینه |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | (پ) | | (8) |
| 1 + | 7 = | | |

لێرە دا ژنەکە هەشتێکی وەرگرت و حەوتەکەی مایەوە لەنێوان براکاندا بە یەکسانی دابەش دەکرێ هەر یەکە یەك بەش ، کوڕە براکەش وەکو برایەك ژماردرا بە گوێرەی وەسیەتی واجبە بەشی باوکی وەرگرت . دەنا لە ئەصڵدا کوڕەکەی کوڕ بارنجە بە براکانی باوکی ، واتە مامەکانی خۆی ، چونکە کوڕ نەوە بارنج دەکات.

**پێداچوونەوەیێك**: ئەگەر بە چاوێکی زانستی تەماشای بڕیاری وەسیەی واجبە بکەین دەردەکەوێ لە جێ نیە ؛ بەڵکو دروست نیە لەبەر ئەم خاڵانەی دێ :

1ـ بەڵگەکانی تەنیا عاتفی و دەروونیە ، واتە شەرعی نیە، ئەو بەڵگانەی دیاریشیان کرد بۆ ئەم مەبەستە نەهاتووە بەڵکو وەسیەتەکە بۆ ئەو کەسەیە بیکا کە لەژیان دایە و نەمردووە .

2ـ خوای گەورە لەو یاسا ناسانە دادوەر ترە و بەم جۆرە بارە ئاگادارو زاناترە لەگەڵ ئەوەشا لە ئایەتەکانی میراتا باسی نەکردووە، ئەگەر وابا باسی دەکرد. هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە ئەرکی ڕوونکردنەوەی قوڕئان بووە وای نەفەرمووە لەگەڵ ئەوپەری دادوەری زانایی بە قوڕئان ، ئەگەر وابا دیاری دەکرد .

3ـ وەسیەت دەبێ کەسێك بیکات کە لەکاتی ژیاندایە بە ویستی خۆی بیکات پاش مردنی بدرێت بە یەکێکی تر وەکو خێرو سەدەقە، بەڵام ئەمەیان نەکراو بە ویستی خاوەن ماڵەکە نەبوو، کەسیش بۆ ویست جێکەی کەس ناگرێتەوە تەنیا بە وەکیلایەتی نەبێ، بەڵام لێرەدا هیچ وەکالەتێك نەبووو دادوەر ئەگەر کاری پێ کرد دەبێتە کاری فزولی کە بە ڕێدانی خاوەنەکەی نەبێ دروست نابێ ، خۆ خاوەنەکەش مردووەو نەماوە هەتا ڕێی پێ بدا، کەوابوو ئەم وەسیەتە بەتاڵە و دروست نیە.

4ـ ئەم بڕیارە پێچەوانەی زۆربەی زانایانی ئیسلامە کە لەسەر ئەوەن کە ئەم وەسیەتە سوننەتە واجب نیە .

لەبەر ئەمە چارەی تر هەیە بەکاری بینین بۆ ئەم کێشەیە ، واتە بەڵگەی شەرعی ئاشکرا تر هەیە بۆ ئەم مەبەستە، دەتوانین کاری پێ کەین ئەویش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خوا دەفەرموێ: ( وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم

مِنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَعْرُوفًا (8)). واتە ئەگەر خزمەكان و هێتیمەكان و هەژارەكان لەكاتی میرات دابەش كردنا ئامادە بوون بەشیان لێ بدەن و قسەی باشیان لەگەڵ بكەن.

ئەم ئایەت ئاڕاستەی میراتگرەكان كراوە كە بەشی ئەو خزمانە بدەن كە ئامادەی دابەش كردنی میراتن و چاویان لێیە ، بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە كە لای زۆربەی زانایانی ئیسلام كاری پێ دەكرێ[96] ، دەتوانین بەشی ئەم جۆرە كەسانە بدەین كە بەزەییمان پێ دێن كە میرات ناگرن. بە ویستی میراتگرەكان وەكو بەخشین و خێر هەر چەندی پێیان بدرێ نەك بە واجب كردن و بەشی دیار كراو. لەگەڵ ئەوەی كە لای كۆی زانایانی شەرعی و یاسایی بەخشین دروستە و كێشەی لەسەر نیە .

[96]) تفسير القرطبي 5|49 ، التفسير الكبير للرازي 9|159 .

# { باسی پێنجەم }

## ﴿ بەشی خوشكی لە دایك وباوك وخوشك لە باوك ﴾

مەبەست لە خوشكی لە دایك و باوك خوشكی دایك و باوكیە، واتە لە باوك و دایكرا خوشكە ، كە بە عەرەبی پێی دەڵێن (الأخت الشقيقة)[97].

خوا لە سورەی نیسادا فەرمویەتی: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (176)) .

واتە لێت دەپرسن میراتی كەلالە ـ واتە ئەوەی نە باوكی هەیە نە منداڵ ـ چۆن دەبێ؟ وەڵامەكە: ئەگەر پیاوێك مرد منداڵی نەبوو خوشكێكی هەبوو نیوەی میرات بۆ ئەوە ، ئەویش میرات لە خوشكی دەگرێ ئەگەر خوشكەكە منداڵی نەبێ ، ئەگەر دوو خوشك بوون دوو سێیەك لەمیراتەكە بۆ ئەوانە، ئەگەر خوشكەكان و برایەكان پێكەوە بوون بۆ هەر نێرێك وەك ئەوەندەی دوو مێیە ، خوا بۆتانی دیار دەكات هەتا گومڕا نەبن ، خوا بە هەموو شتێك زانایە[98].

بە گوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە میراتی خوشكان بەم جۆرەیە:

---

97 ) بۆیە ناوم نا خوشكی لە دایك و باوك چونكە بە زاراوەی ئێمە وا بەكار دێت ، هەتا تێكەڵ نەبێ لەگەڵ پلك و پوور .

98 ) تفسير البيضاوي 1\251

**یەكەم : (بەشی خوشكی لە دایك و باوك[99](الأخت الشقیقة))**

**ئەم خوشكە حەوت حالەتی میرات گرتنی هەیە بەو جۆرانەی خوارەوە:**

**حالەتی یەكەم:** ئەگەر تەنیا یەك خوشكی دایك و باوكی هەبوو نیوەی میرات دەبات بەم مەرجانەی خوارەوە:

1ـ برای دایك و باوكی لە گەڵدا نەبێت .

2ـ مردووەكە لقی میرات گری نەبێ نە نێر نە مێ .

3ـ مردووەكە باوكی نەبێ چونكە باوك حەجبی دەكات. لای ئیمامی حەنەفی باپیریشی نەبێ چونكە باپیر دەبێتە هاوبەشی وەك برای هەبێ وایە .

نموونە(1): ژنێك مرد لە مێردی و خوشكێكی دایك و باوكی ، میراتەكەیان بەم جۆرەیە.

| بنچینەی مەسەلەكە | خوشكی لە دایك باوك | | مێرد |
|---|---|---|---|
| (2) | $\frac{1}{2}$ | | $\frac{1}{2}$ |
| = | 1 | + | 1 |

ئەلێرە خوشكەكە نیوەی خۆی لە دوان برد كە كردیە یەك ، مێردەكەشی نیوەی تری برد كە ئەویش هەر یەك بوو .

99 ) مەبەست لە خوشكی دایكو باوكی ئەو خوشكەیە كە لە هەردوكیانە واتە لە دایكی و لە باوكیەتی ، واتە دایكوباوكیان یەكە .

**نموونە(2):** پیاوێك مرد لە دایكی و ژنەكەی و خوشكێكی دایكو باوكی(شقیقە) ، میراتەكەی بەم جۆرەیە:

| ژن | دایك | خوشكیكی لە دایك باوك | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{1}{2}$ | (12) |
| 3 + | 4 + | 6 = | سەركەوت بۆ (13) |

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر خوشكی لە دایك و باوك دوو بوون یا پتر دوو سێیەكی میراتەكە دەبەن بە هەمان مەرجەكانی حاڵەتی یەكەم .

**نمونە (1):** یەكێك مرد لە دوو خوشكی لە دایك و باوك لە گەڵ دوو برای لە دایك، میراتەكەیان بەم جۆرەیە:

| (2)خوشكی لە دایك و باوك | (2) برای لە دایك | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{3}$ | (6) |
| 4 + | 2 = | |

لێرەدا ماڵەكە دەبێتە شەش بەش، چواریان بۆ دوو خوشكەكانی لە دایك و باوك دوانیشی بۆ براكانی لە دایك . بۆیەش مەسەلەكەمان لەشەش دانا هەتا مەسەلەكە ڕێك كەوێت.

**نموونە(2): یەکێك مرد لە دوو خوشکی و ژنەکەی و مامی، میراتەکەی بەم جۆرەیە :**

| (2) خوشکی لە دایکوباوك | ژن | مام | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{4}$ | پ | (12) |
| 8 + | 3 + | 1 = | |

**لەم مەسەلەیەدا خوشکەکان (8) بەشیان برد کە دەکاتە دوو سێیەکی (12) ژنەکەش (3)بەشی برد ، ماوە (1) بۆ مامەکە کە عەصەبەیە .**

**حالەتی سێیەم:** خوشکی لە دایکو باوکا ئەگەر برای لەگەڵدا بوو دەبێتە عەصەبە لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين ) میرات دەگرێ . بە مەرجی ئەوەی مردووەکە لقی میرات گری نەبێ نە نێر نە مێ ، باوکیشی نەبێ چونکە باوك حەجبی دەکات .

**نمونە:** پیاوێك مرد لە ژنێکی و خوشکێکی و برایەك ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| ژن | خوشکی دایکو باوکی | برای دایکوباوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پ(3) | | (4) |
| 1 + | 1 + | 2 = | |

لێرەدا ژنەکە بەشێکی برد لە چوار، سێ بەش ماوە یەکێکیان بۆ خوشك و دوویان بۆ براکەی .

**حالەتی چوارەم:** لای زۆری زانایان خوشکی لە دایك و باوکا میرات بە عەصەبە دەگرێت لەگەڵ هیتر(التعصیب مع الغیر) ـ کچی مردووو کچی کوڕی و بەرەو خوارەوە ـ جا پاشماوەی میراتەکە دەگرێت پاش بەشی خاوەن بەشە دیارکراوەکان(أصحاب الفروض). بە دوو مەرج :

1. مردووەکە کوڕی نەبێ و باوکیشی نەبێ .
2. برای دایکو باوکی نەبێ ، ئەگەر هەیبوو میرات بە عەصەبە بە هۆی هی تر(العصبە بالغیر)دەگرێت.

**نموونە(1):** یەکێك مرد لە کچی و خوشکی لە دایك و باوك ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| کچ | خوشکی دایکو باوکی | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (2) |
| 1 + | 1 = | |

لیرەدا کچەکە کە خاوەن بەشی دیارکراوە نیوەی برد کە کردیە بەشێك لە دوو، خوشکەکەش پاشماوەکەی برد کە بەشەکەی ترە لە دووەکە .

**نموونە(2):** یەکێك مرد لە کچی کوڕی و خوشکیکی لەدایك و باوکی ، میراتەکەی بەم جۆرەیە:

| کچی کوڕ | خوشکیکی لە دایك و باوك | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (2) |
| 1 | + 1 | = |

لێرەدا کچەکە نیوەی برد وەکو بەشی دیار کراوی خۆی(فرض) کە بەشێکە لە دوو، خوشکەکەش یەکەکەی تری برد کە پاشماوەکەیە .

**نموونە(3):** پیاوێك مرد لە ژنی و کچی کوری و خوشکی دایکو باوکی

| ژن | کچی کوڕ | خوشکی دایکو باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (8) |
| 1 | + 4 | + 3 | = |

لێرەدا مالەکە هەشت بەشە ، ژنەکە هەشتێکیکی برد کە کردیە یەك بەش کچی کوڕیش نیوەی برد کە کردیە چوار، پاشماوەکەش سێ بوو بۆ خوشکی دایکو باوکی مایەوە .

**حالەتی پێنجەم:** ئەگەر برای لەدایك و باوکی لەگەڵدا بوو لەگەڵ براو خوشکی لە دایك و خاوەن بەشی تر، بەجۆریکی وا هیچیان بۆ نەماوە ، چونکە لەگەڵ براکەی دەبنە عەصەبە و بەشەکانی خاوەن بەشەکانیش هەموو میراتەکە دەگرێتەوە، لەبەرئەمە دەبێ لە گەڵ خوشك و برای لە دایکیان بژمێردرێن بە یەکسانی هەتا میراتیان بەر کەوێ .

**نموونە:** ژنێك مردو دایك و خوشك وبرایەکی دایکوباوکی و دوو برای دایکی لە پاش بەجێما ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:

| مێرد | دایك | خوشکی لە (د ، ب) | برای لە (د ، ب) | (2) برای لە (د) | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | پاشـماوە | | $\frac{1}{3}$ | (6) |
| 3 + | 1 + | هیـچ نەماوە + | | =2 | |

لێرەدا مالەکە دەبێتە شەش بەش، سیانی بۆ مێردو یەکێکیشی بۆدایك ودووی بۆ برای دایکی، کەوابوو هیـچ بۆ خوشك و برای دایکو باوکی نەماوە ، لەبەر ئەوە دەبێ مەسەلەکە دووبارە بکەینەوەو هەرچواریان بە خوشك و برای لە دایك بژمێرین هەتا ئەوانیش میرات بگرن چونکە گشتیان دایکیان یەکە، بەم جۆرەی خوارەوە:

| مێرد | دایك | (4) براو خوشکی لە دایك | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | 12 =2×(6) |
| 3 + | 1 + | 2 = | |
| 6 + | 2 + | 4 = | |

بەڵام لێرەدا (2)بەسەر (4) براو خوشکەکەدا بەبێ کەرت دابەش ناکرێت ، بۆیە بنچینەی مەسەلەکە لە دوو دەدەین، دەبێتە (12)، (6) بەش بۆ مێرد، (2) بەش بۆ دایك (4) بەش بۆ چوار خوشك و براکە هەر یەکە یەکیکیان بەردەکەوێ[100] .

**حاڵەتی شەشەم:** ئەگەر باوکی لەگەڵدابوو بارنج دەبێت و هیچ ناگرێ .

نموونە: یەکێك مرد لە باوکی و ژنی و خوشکی میراتەکی بەم جۆرەیە :

| ژن | باوك | خوشکێکی دایکو باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پ | بارنجە | (4) |
| 1 + | 3 + | هیچ = | |

لێرەدا ژنەکە بەشێکی برد لە چوارو باوکەکەش پاشماوەکەی کە (3) بوو بردی خوشکەکەش چونکە بە باوك بارنج بوو هیچی نەبرد .

بە گوێرەی یاسا خوشکی دایك باوکی وەکو برای دایکو باوکی دەژمێرردرێ ، هەروەك لە ڕاست کردنەوەی هەشتی ژمارە 34 ساڵی 1983دا برگەی (4) ی زێدە کرا لە مادەی (89) کە دەڵێ: (خوشکی دایك باوکی وەکو برای دایکو باوکییە لە حەجب کردندا ).

---

100) ئەم مەسەلەیە ناوی نراوە (مشرکە) چونکە خوشکو براکان هەموویان لەگەڵ یەك بوونە هاوبەش . هەروەها ناوی نراوە (عمریە ) چونکە لە زەمانی ئیمامی عومەرﷺ ڕووی دا ئەو چارەی کرد بەم جۆرە ،هەروەها پێی وتراوە ( حجریە) چونکە براو خوشکی دایکو باوکی ووتیان وا دابنێ کە باوکمان بەرد بووە خۆ دایکمان یەکە !، بۆ وەکو ئەوان میرات ناگرین ؟ .

واتە : ئەگەر پیاوێك لە پاشی بەجێما: ژن و خوشکی دایکو باوکی و برایەکی باوکی و کوڕی برای دایکوباوکی ، میراتەکەی بەگوێرەی یاسا بەم جۆرەیە :

| ژن | خوشکی لە (د ، ب) | برای لە (ب) | کوڕی برای لە(د، ب) | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{2}$ | بارنجە | بارنجە | (4) |
| 1 + | (1 + 2) + | هیچ | | = |

ئەم هەموار کردنە بە گوێرەی فقهی جەعفەری هاتووە ، چونکە لای وان خوشکی دایکو باوکی نمرەی یەکەمە لە پلەی دووەم ، براو خوشکی باوکی میراتیان لەگەڵ ناگرن چونکە ئەمانە لە نمرەی دووەمن .

**حالەتی حەوتەم:** ئەگەر لەگەڵ باپیری واتە باوکی باوکی دابوو لای (جمهور) زۆرینەی زانایان جگە لە ئیمامی حەنەفی هەروەك لە گەڵ برای کۆ ببێتەوە وا دادەندرێ . ئەمەش دوا ئەخەینە باسی میراتی باپیر.

## بەهێزی میراتگرتنی خوشکی لە دایك و باوك:

1. خوشك بارنج دەبیت بە باوکی مردوو کوڕەکەی و کوڕی کوڕی و بەرەخوار ، ئەگەر لەگەلیان بێ بە تفاقی هەموو زانایانی شەریعەت میرات ناگرێ .

ـ خزمەکانی خاوەن ڕەحم لەگەلیا میرات ناگرن، ئەگەر لەیەك پتر بوو خوشکەکانی لە باوکیشرا بە تفاقی زانیانی شەریعەت بارنج دەکات .

ـ لای فقهی جەعفەری بارنج دەبێ بە دایکی مردوو و کوڕو کچەکانی و کوڕی کوڕی

و بەرەو خوار ؛چونکە ئەمانە لە پلەی خزمایەتی یەکەمن و خوشکی دایکو باوکی پلەی دووەمە .

ــ هەروەها لە فیقهی جەعفەریدا نایەلێ خزمەکانی پلەی سێیەم و خزمەکانی پاش نمرە یەك لە پلەی دووەمدا میرات بگرن .

ــ لە یاسادا خوشکی دایکو باوکی لەگەڵ کچی مردوا بارنج دەبێت و میرات ناگری .

## دووەم : (میراتی خوشکی لە باوك)

خوشکی تەنیا لە باوکرا خوشك بێ هەمان حالەتەکانی خوشکی لە دایك و لە باوکا هەیە ، تەنیا نابێتە هاوبەشی خوشك و براکانی لە دایك، یاساش وەکو خوشکی لە دایك و باوکی دانەناوە بۆ بارنج (حەجب) کردن، جگە لەوە ئەم حالەتانەی خوارەوەی هەیە:

**حالەتی یەکەم** : شەشێکی میرات دەبات ئەگەر یەك خوشکی لە دایك و باوکا لە گەڵدا بوو .

**نمونە:** ژنێك مرد ، میراتگرەکانی مێردو خوشکیکی لە دایکو باوکا و خوشکێکی لە باوکا بوون ، میراتەکەیان بەم جۆرەیە:

| مێرد | خوشیکی لە دایکو باوك | خوشکیکی لە باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 3 + | 3 + | 1 = | سەرکەوت بۆ (7) |

کەوابوو ماڵەکە دەکەینە حەوت بەش سیانی بۆ مێرد و سیانیشی بۆ خوشکی لە دایکو باوك و یەکیکیشی بۆ خوشکی لە باوك .

بەڵام بە گوێرەی مادەی (89) لە یاسای باری کەسایەتی عیراقی خوشکی لە باوکی حەجب دەبێ بە خوشکی لە دایکو باوك، کەوابوو بە گوێرەی یاسا ماڵەکە دەکرێتە دوو بەش، یەکێکیان بۆمێردو ئەوی تریان بۆ خوشکی لە دایکو باوك .

بەڵام ئەم یاسایە هەڵەیە و بۆچوونی فیقهی ئیسلامی ڕاستە و دادترە ؛ چونکە ئەم خوشکە لەباوکرا زۆر نزیکە بۆ میرات گرتن، تەنیا دایکی جودایە؛ بۆیە پێویستە ڕێی لێ نەگیری میرات لەگەڵ خوشکەکەی لە دایکو باوکا بگرێ مادام بارنج نابێت .

**حالەتی دووەم:** خوشکی لە باوك ئەگەر دوو خوشکی لە دایك و باوکا لەگەڵدا بوو بە ئیجماعی زانایان بارنج دەبێت واتە بێ بەش دەبێت .

**نموونە:** ژنێك مرد میراتگرەکانی مێردی و دوو خوشکی لەدایکوباوك و خوشکێکی لە باوك بوون، میراتەکەیان بەم جورمیە:

| مێرد | (2) خوشکی لە دایکو باوك | خوشکێکی لە باوك | بنچینەی |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | بارنجە | (6) |
| 3 + | 4 + | هیچ = | سەرکەوت بۆ (7) |

کەوابوو ماڵەکە دەکەینە حەوت بەش سیانیان بۆ مێردی و چواریشی بۆ دوو خوشکەکەی لە دایکو باوك . خوشکی لە باوکیش بارنج بوو هیچی بەرنەکەوت .

ـ بە گوێرەی یاسای عیراقی مادەی 2\91 بەیەك خوشكی لە دایك و باوكیشا حەجب دەبێ ، ئەم بۆچوونەی لە فیقهی جەعفەری وەر گرتوە . بەڵام هەروەكو وتمان بۆچوونی جمهوری زانایان ڕاسترە.

**حاڵەتی سێیەم:** خوشكی لە باوك لەگەڵ برای لە باوكا دەبنە عەصەبە، پێكەوە میرات دەبەن لە سەر ڕێسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين ).

نمونە: پیاوێك مرد لە ژنێك و براو خوشكێكی لە باوكیان ، میراتەكەیان بەم جۆرەیە:

| ژن | برایێكی باوكی | خوشكێكی باوكی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | {پ(3)} | | (4) |
| 1 + | 2 + | 1 = | |

كەوابوو ماڵەكە دەكرێتە چوار بەش یەكێكیان بۆ ژنەكە ، دەمینێتەوە (3): لەم سێیە دوویان بۆ براكە و یەكێكیشیان بۆ خوشكەكە .

**حاڵەتی چوارەم:** ئەگەر برای لە دایكو باوكیا(الأخ الشقيق) لەگەڵدا بوو حەجب دەبێ و هیچی بەر ناكەوێ .

**نموونە:** ئەگەر یەكێك مرد ژنێك و برایەكی لە دایكوباوكا لەپاش بەجێما لەگەڵ خوشكێكی لە باوكا، میراتەكەیان بەم جۆرەیە:

| ژن | برای دایکو باوکی | خوشکی باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (بارنجە) | (4) |
| 1 + | 3 + | هیچ = | |

لێرەدا میراتەکە دەکرێتە چوار بەش یەکێکی بۆ ژنەکە وسیانیشی بۆ برای لە دایکو باوک ، خوشکی لە دایکو باوکا لێرە هیچ وەرناگرێ چونکە بارنجە .

## بەهێزی میراتگرتنی خوشکی لە باوك :

1ـ هەر میراتگرێکی نایەڵێ خوشکی لە دایکو باوکا میرات بگرێ نایەڵێ خوشکی لە باوکیشا میرات بگرێ. جگە لەوەی کە حەجب دەبێت بە دوو خوشکی لە دایکو باوك یا پتر .

2ـ هەر کەسێ میرات لەگەڵ خوشکی لە دایکو باوکا نەگرێ لەگەڵ خوشکی لە باوکیشا ناگرێ تەنیا برای لە باوکا نەبێت .

# { باسی شەشەم }

## ﴿ میراتی براو خوشكی لە دایك ﴾

خوا لە سورەی نیسادا فەرمویەتی:(وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ(12))

واتە ئەگەر پیاوێك بە حالەتی كەلالە ـ واتە منالْ و باوك و باپیری نەبوو ـ میراتی لێ بگیری یا ژنێك لەم جۆرە ، برایەكی لە دایك یا خوشكێك لە دایكی هەیە ، ماڤ هەر یەك لەوان شەشێكی میراتە ، ئەگەر لە یەك پتر بوون هەموویان هاوبەشن بە یەكسانی لە سێیەكەكە ، پاش ئەوەی وەسیەت و قەرز دەدرێتەوە ، بەبێ زیاندان لە وەسیەت بۆ وەسیەت بۆكراوان یا لە قەرزی خاوەن قەرزان یا لە میراتی میراتگران، ئەمە راسپاردن و فەرمانی خوایە،دڵنیابن خوا زاناو دانایە.واتە لە هەموو فەرمانێكدا مەبەست و حیكمەتی هەیە[101].

بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە خوشكی لە دایكڕا (خوشكی دایكی) سێ حالەتی هەیە:

**حالەتی یەكەم:** ئەگەر یەك خوشكی لە دایك یا یەك برای لە دایك هەبوو شەشێكی میراتی بەر دەكەوێ :

---

101 ) زبدة التفسير من فتح القدير ص100 ، تەفیسري طولشقن ، للأستاذ نظام الدين عبد الحميد 196\1

| نمونە: | (1)برای لە دایك | (1)برای لە دایکو باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| | $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | (6) |
| | 1 | + 5 = | |

برای لە دایك شەشێکی برد، برای لە دایك و باوکیش چونکە عەصەبەیە پشماوەکەی برد کە پێنجە...لێرەدا ئەگەر لە جیاتی برای لە دایك خوشکی لە دایك با هەمان یەکی بەر دەکەوت .

**حالەتی دووەم:** ئەگەر خوشکی لە دایك یا برای لە دایك لە یەك پتر بوون ، واتە دوو یا سێ یا پتر، یا خوشك و برای دایکی پێکەوە بوون و لە یەکیش پتر بوون ، بە هەموویان سێیەکی میراتەکە دەبەن و هاوبەشن لێی بە یەکسانی ،واتە بە سەریانا دابەش دەکری بە یەکسانی بەبی جیوازی نیوان کچ و کوڕ .

| نموونە(1): | مێرد | خوشکێك و وبرایەکی لە دایك | داپیر | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| | 3 | + 2 | + 1 = | |

مێردەکە سێ بەشی بردو، خوشك وبرای لە دایکیش دوو بەشیان برد بۆ هەر یەکە یەکیك ،داپیریش بەشێکی برد .

نموونەی (2) :

| ژن | (2) برای لە دایکی | برایەکی لە دایکو باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | (12) |
| 3 + | 2 + | 7 = | |

نمونەی (3):

| ژن | خوشکی باوکی | خوشکێك و برایەکی دایکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | (12) |
| 3 + | 6 + | 4 = | سەرکەوت بۆ(13) |

کەوابوو بنچینەی مەسەلەکە بوە (13)، جا (3) بۆ ژنەکەو (6) بۆ خوشکی باوکی و (4) بۆ خوشك و برای دایکی بۆ هەریەکیان(2) .

**حالەتی سێیەم:** ئەگەر مردوەکە لقی میراتگری یا ڕەگەزی نێری میراتگری هەبوو براو خوشکی دایك و باوکی هیچ نابەن و بارنج دەبن .

نموونە(1):

| (2) کوڕ | (2) برای دایکی | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| گشت ماڵەکە | (بارنجن) هیچ نابەن | (2) |

دوو کوڕەکە عەصەبەن بۆیە گشت ماڵەکەیان برد دەیکەنە دوو بەش هەر یەکە بەشێك، برایەکانی دایکی چونکە بارنجن بە کوڕەکان هیچ نابەن .

نموونە(2):

| باوك | (5)کوڕ | (3)خوشکی دایکی | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{6}$ | پاشماوەکە | بارنجن | (6) |
| 1 + | 5 + | هیچ = | |

# { باسی حەوتەم }

## ﴿ بەشی باپیرو داپیر لە میراتا ﴾

لە بەر ئەوەی دەقێکی دیار لە قورئانی پیرۆزدا نەهاتووە بۆ دیار کردنی میراتی باپیرو داپیر، بۆچوونی زانایانی شەریعەت لەم بابەتەدا جیاوازە بۆ دیار کردنی جۆری میراتگر لە هەر یەك لەباپیرو داپیر کە لەرێی باوك یادایکەوەن، هەروەها جیاوازن لە دیار کردنی بەشەکانیان، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ خوشك و برا کۆ ببنەوە! دیسان ئایا باوکی باوك جیگەی باوك دەگرێتەوە لە بارنج(حجب) کردنا یان نا ؟ . وەك بەم جۆرەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێ :

## یەکەم : ( میراتی داپیر )

چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لە باسی بەشی داپیرا هاتووە وەك:

1ـ عن بريده: (أن النبي ﷺ جعل للجدة السدس إن لم يكن دونها أم )[102]. واتە پێغەمبەر ﷺ شەشێکی بۆ داپیر داناوە ئەگەر دایکی لە پێش نەبێ.

2ـ عن عبادة بن الصامت: (أن النبي ﷺ قضى للجدتين من الميراث بالسدس بينهما)[103]. واتە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دادگایی داوە بە شەشێك بۆ دوو داپیر لە نێوانیاندا دابەش بکرێ.

102) أنظر مرقاة المفاتيح 6\212 الحديث رقم 3049. وقال رواه الحاكم وصححه .

103) سنن أبي داود 3|122 الحديث رقم 2895 .وفي إسناده عبيد الله العتكي وصححه ابن السكن | أنظر تلخيص الحبير 3\88 الحديث رقم 1350.

3ـ عن عبد الرحمن بن يزيد قال: ( أعطى رسول الله ﷺ ثلاث جدات السدس ، اثنتين من قبل الأب وواحدة من قبل الأم )[104]. واتە پێغەمبەر ﷺ شەشێکی دا بە سێ داپیر دوانیان لە لایەنی باوك و یەکێکیان لە لایەنی دایك بوو.

## جۆرەکانی داپیر بۆ میراتگرتن:

زۆربەی زانایانی شەریعەت دیاریان کردووە کە داپیر دوو جۆرە :

1 ـ داپیری لە خاوەن ڕەحمان (ذوي الأرحام) : ئەو داپیرەیە کە بەرێگەی باپیرێکی ڕەحمی بە مردوەکە بگاتەوە ، وەك دایکی باوکی داك ، ئەمەش لە بەشی میراتی خاوەن ڕحمەکاندا باس دەکرێ .

2ـ داپیری لە خاوەن بەشەکان(من اصحاب الفروض): ئەم داپیرەیە کە هەر بە هۆی پیاو بگاتەوە مردوەکە یا هەر بە هۆی ژن بگاتەوە مردوەکە ، واتە باپیری ڕەحمیان لە نێواندا نەبێ ،وەك: دایکی باوك یا دایکی باوکی باوك و بەرەو سەرەوە، یا دایکی دایك یا دایکی دایکی دایك و بەرە سەرەو ، یا دایکی هەردوولا بێ ، واتە دایکی دایکی دایك کە لە هەمان کاتیشا دایکی باوکی باوك بێ . ئەم جۆرە میراتەکەی بەم شێوەیە: لای زۆربەی زانایان بەشی داپیر شەشێکە چ لە لایەنی دایکا بێ یا لە لایەنی باوکا بێ یا لەلایەنی هەردووکیان. لەبەر ئەو فەرموودانەی سەرەوە کە لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە . بەڵام ئەم حالەتانەی هەیە:

104 ) سنن الدرقطني 4\90 ، وهو مرسل ولكن لم يعلم في ذلك عن الصحابة خلاف ، وروي متصلا عن زيد بن ثابت بلفظ آخر ، | انظر أنظر تنقيح تحقيق أحاديث التعليق لشمس الدين محمد بن أحمد بن عبد الهادي الحنبلي 3\130 الحديث رقم 1739 .

**حاڵەتی یەکەم** : داپیری ڕاستەو خۆ واتە دایکی باوك یا دایکی دایك ئەگەر بەتەنیا بوو شەشێکی میرات دەبات ئەگەر میراتگری پێشلێگری لە پێشا نەبێ حەجبی بکات بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لە سەرەوە کە دایك شەشێك دەبات .وەك:

نموونە (1):

| داپیردایکی باوك | برای لە دایکو باوك | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | (6) |
| 1 | + 5 | = |

نموونە(2):

| ژن | دایکی دایك | یەك کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | پ | (24) |
| 3 | + 4 | + 17 | = |

**حاڵـەتی دووەم**: ئەگـەر داپیرەکـانی هـەردوولا پێکـەوە بـوون هـەردووکیان لـە شەشێکەدا بەشدارن. بە پێی ئەو فەرموودانەی سەرەوە کـە پێغەمبـەرﷺ شەشـێکی دا بە دوو دایك و سێ دایك. نموونە:

| داپیری( دایکی دایك) | داپیری(دایکی باوك) | برایەکی لە باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| ($\frac{1}{6}$) | | پاشماوە | (6) |
| 1 | | + 5 | = |

لێرەدا بنچینەی مەسەلە کە(6)ـە لە (2)ی دەدەین، بۆ ئەوەی ببێتە (12) ، هەتا بەشی داپیرەکان ببێتە(2)بەش بەسەریاندا دابەش بکرێت بەبێ کەرت، بەشی برایەکەش دەبێتە (10) . بەم جۆرە:

| داپیری( دایکی دایک) | داپیری(دایکی باوک) | | برایەکی لە باوک | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $(\frac{1}{6})$ | | | پاشماوە | (12) =2× (6) |
| 1 | | + | 5 = | |
| 2 | | + | 10 = | |

**حاڵەتی سێیەم:** دایک ، داپیری لایەنی خۆی و لایەنی باوک بارنج (حجب) دەکات ، بەڵام باوک تەنیا داپیری لایەنی خۆی حەجب دەکات .

نموونە(1):

| مێرد | دایک | کوڕێک | داپیری لای دایک و داپیری لای باوک | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | پ | بارنجن | (6) |
| 3 + | 1 + | 2 + | هیچ = | |

لێرەدا دایک هەردوو داپیرەکەی لەلای دایک و باوک بارنج دەکات هیچ وەرناگرن.

نموونە(2):

| ژنێك | باوك | داپیری لای دایکی | کوڕێك | داپیری لای باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | بارنجە | (24) |
| 3 + | 4 + | 4 + | 13 + | هیچ = | |

لێرەدا تەنیا داپیری لای باوکی بارنج بوو چونکە بەڕێی دایکدا بۆ مردووەکە دەگەڕێتەوە.

**حالەتی چوارەم:** هەر داپیرێکی نزیکتر لەلایەنی دایکی مردووەکە بێ هی دوورتر لەلایەنی هەردوولا بارنج دەکات ، بەڵام لە لایەنی باوکا تەنیا داپیری لایەنی خۆی بارنج دەکات، لای مالیکی و شافیعیەکان، بەڵام لای حەنەفیەکان و حەنبەلیەکان داپیری هەردوولا وەکو یەکن، واتە هەردووکیا دوورتری هەردوولا بارنج دەکەن .وەك: نموونە(1):

| ژن | دایکی دایك | دایکی باوکی باوك | کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | بارنجە | پ | (24) |
| 3 + | 4 + | هیچ + | 17 = | |

لێرەدا دایکی باوکی باوك بە دایکی دایك بارنجە چونکە دوور ترە .

نموونە(2) :

| بنچینە | دایکی دایکی دایك | دایکی باوك | مێرد |
|---|---|---|---|
| (6) | بارنجە | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ |
| | = هیچ | + ( 2 + 1) | + 3 |

(بە بەش وبە گەڕاندنەوە بۆی (بالفرض والرّد)

ئەمە بە گوێرەی ڕێبازی حەنەفی و حەنبەلی ، بەڵام بە گوێرەی ڕێبازی مالیکی و شافیعیەکان بارنج نابێت.

ـ لای جەعفەریەکان داپیر لە پلەی دووەمی میراتگرەکانە، ئەو داپیرەی دایکی باوکە جێی باوك دەگرێتەوە بۆ میراتگرتن ، ئەو داپیرەی دایکی دایکە جێگەی دایك دەگرێتەوە ، واتە ئەگەر دایکو باوك نەمابوون، دایکی باوك سێیەکی میرات دەبات و دایکی دایکیش شەشێك ، ئەگەر پێکەوە بوون و لقی میراتگریان نەبوو .

ـ لە یاسادا داپیر بە کچ حەجب دەبێت وەك لە ماددەی 2\91 دا دەڵێ:(کچ یا کچان ئەگەر مردووەکە کوڕی نەبێ پاشماوەی میراتەکە دەبەن پاش بەشی دایك و باوك و هاوسەر لە میراتەکەدا، ئەگەر هیچ کامیشیان نەبوو هەموو میراتەکە دەبەن)[105] کە چی بە گوێرەی مادەی (90) بارنج ناکرێ بە کوڕ کە دەڵێ: (لە گەڵ ڕەچاو کردنی ئەوەی پێشوو ، دابەش کردنی ماف و بەشەکان بەسەر میراتگرەکانا بە گوێرەی حوکمەکانی شەریعەت دەکرێ کە ڕەچاو کرابوو پێش دانانی یاسای بارەکانی

105 ) نص المادة 91 فقرة 2: ( تستحق البنت أو البنات في حالة عدم وجود ابن للمتوفى ماتبقى من التركة بعد اخذ الأبوين و الزوج الآخر فروضهم منها ، وتستحق جميع التركة في حالة عدم وجود أي منهم) .

کۆمەڵایەتی ژمارە 188 ی ساڵی 1959 وەك ئەوەی پێدا هاتراوەتەوە لە حوکمەکانی تری میرات) [106]. لێرەدا بەگوێرەی ئەم ماددەیە کە کوڕ باسی نەکراوە هەر لەسەر شەریعەت دەمینێتەوە کە داپیر حەجب ناکات، کەچی بەکچیان حەجب کردوە، ئەمەش پێچەوانەی شەرعە دەبێ چاوی ڕاستکردنەوەی پیادا بخشێتەوە.

**بەهێزی میراتگرتنی داپیر:**

1. داپیر لە لایەنی دایك و لە لایەنی باوکا هەردووکیان بە دایك بارنج دەبن ، بەڵام باوك تەنیا داپیری لایەنی خۆی بارنج دەکات .
2. باپیر بارنجی هەموو داپیرێك دەکات کە بە ڕێی خۆیدا بگەڕێتەوە بۆ مردوو.
3. لای زۆربەی زانایان هەموو داپیرێکی نزیکتر داپیری لە خۆی دوورتر بارنج دەکات جا چ لەلایەنی دایکا بێ یا لەلایەنی باوکا بێ ، جا نزیکەکە میراتگر بێ یا بارنج بێت بە میراتگری تر .
4 . داپیری خاوەن فەرز داپیری خاوەن ڕەحم لای زۆربەی زانایان بارنج دەکات.

## دووەم: ( میراتی باپیر )

باپیر وەك باوکی باوك و باوکی باوکی باوك و بەرەو سەرەوە لە پشتەکانی ڕەگەزی . زوربەی زانایان بە هەمان شێوەی داپیر ، باپیریشیان داناوە بە دوو جۆر:

1. باپیری عەصەبە( ڕەگەزی): کە پێی دەڵێن باپیری ڕاست (الجد الصحیح) ئەو

106 ) نص المادة 90:( مع مراعاة ما تقدم یجري توزیع الإستحقاق والإنصبة علی الوارثین بالقرابة وفق الأحكام الشرعیة التي كانت مرعیة قبل تشریع قانون الأحوال الشخصیة رقم 188 لسنة 1959 كما تتبع فیما بقي من أحكام المواریث).

**باپیرەیە کە هیچ دایکێکی ناکەوێتە نێوان ئەوو مردووەکە. وەك: باوکی باوك یا باوکی باوکی باوك و بەرەو سەرەوە، کە ئێستا لە باسی میراتەکەی داین .**

**2۔ باپیری خاوەن ڕەحم: کە پێی دەڵێن باپیری ناڕاست (الجدّ غير الصحيح) ئەو باپیرەیە کە بە ڕێی ژنێك واتە دایکێك دەگەڕێتەوە بۆ مردوو وەك: باوکی دایك و باوکی دایکی باوك، ئەوەش لە خاوەن ڕەحمەکانە کە لە باسی میراتی خاوەن ڕەحمەکاندا باسی دەکەین.**

**بەڵگەکانی میراتی باپیر: ئەم فەرمووده پیرۆزانە لە میراتی باپیرا هاتوون :**

1۔ عن عمران بن حصين ﷺ أنّ رجلاً أتى النّبيّ ﷺ فقال: إنّ ابن إبني مات فمالي من ميراثه ؟ قال: لك السّدس، فلمّا أدبر دعاه فقال لك سدسٌ آخر ! فلمّا أدبر دعاه فقال: إنّ السّدس الآخر طعمة لك ، قال قتادة: فأقلّ شيء يرث الجدّ السّدس ، لأنّ رسول الله ﷺ ورثّه السّدس ، ولا ندري مع من ورثه[107] .

**واتە عیمرانی کوری حەصین گێرایتیەوە: کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: کوڕی کوڕم مردووە چیم بۆهەیە لە میراتی ئەو ؟ فەرموی: شەشێك، کە پشتی کردەوە بانگی کردو فەرموی: شەشێکی ترت بۆ هەیە ،کەپشتی کردەوە بانگی کردو فەرمووی ئەو شەشێیەکەی تر خێرە بۆ تۆ. واتە ماف نیە ۔ ناشزانین لەگەڵ کێ میراتی پێدا !.**

2۔ انّ عمر بن الخطّاب ﷺ سأل عن فريضة الجدّ، فقام معقل بن يسار المزني فقال: قضى فيها رسول الله ﷺ فقال : ماذا؟ قال السّدس قال مع من؟ قال لا

107) المنتقى لابن الجارود 1\242 الحديث رقم 961 .

أدري ، قال لا دريت ! فما تغني إذاً[108] ؟ .

واتە ئیمامی عومەر پرسیاری لە بەشی باپیر کرد، مەعقەلی کوڕی یەساری موزەنی هەستاو ووتی: پێغەمبەر ﷺ دادگایی لێکرد، ووتی: بەچی ، وتی: بەشەشێك ، ووتی لەگەڵ کێ؟ وتی نازانم، وتی یاخوا نەزانی ، کەوابوو کەلك نادا .

3. عن عيسى بن أبي عيسى أن زيد بن ثابت قال لعمر بن الخطابﷺ: أن رسول الله ﷺ أعطى الجد سدس المال مع الولد الذّكر ومع الأخ الواحد النصف ومع الإثنين فصاعدا الثلث وإذا لم يكن وارث غيره فأعطاه المال كله[109] .

واتە عیسای کوری باوکی عیسا گێرایتیەوە کە زەیدی کوڕی سابیت بە عومەری کوڕی خەتابی وت: پێغەمبەرﷺ شەشێکی ماڵی دا بە باپیر لەگەڵ منالی نێر ، وە لەگەڵ یەك برا نیوە ، و لەگەڵ دوو و زیاتر سێیەك ، وە ئەگەر جگە لە ئەو میراتگر نەبا هەمووو ماڵەکەی پی دەدا .

باپیر یا براو خوشکەکانی مردوودی لەگەڵدا دەبێت یا لە گەڵیدا نابێت، تەنیا میراتگری تری لەگەڵدا دەبێت .

## یەکەم : (باپیر لەگەڵ میرات گری تر بەبێ براو خوشك)

ئەگەر براو خوشکی لەگەڵدا نەبوو و میراتگری تری لەگەڵدا بوو جگە لە بارنجکەرەکان سێ حالەتی هەیە :

108) مسند الإمام احمد 5\27 الحديث رقم 20324 . . تحفة الأحوذي 6\231 قال :اخرجه ابو داود والنسائي .

109) مسند الحارث بزوائد الهيثمي 1\533 الحديث رقم 475.

**حاڵەتی یەکەم** : شەشێکی میراتەکە دەبات لەگەڵ لقی میراتگری نێر، بەمەرجێ باوکی مردووی لەگەڵدا نەبێ چونکە بە باوك بارنج (حجب)دەبێت. نموونە:

| باپیر | کوڕ | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | پ | (6) |
| 1 + | 5 = | |

واتە بەشێك بۆ باپیرو پاشماوەکەشی کە پێنج بوو بۆ کوڕەکە چونکە (پشتە) عەصەبەیە .

**حاڵەتی دووەم**: ئەگەر هیچ لقی میراتگری لەگەڵدا نەبوو دەبێتە (پشت) عەصەبە و پاشماوەی میراتەکە دەبات بە مەرجێ باوکی مردووی لەگەڵدا نەبێت .

نمونە (1):

| ژن | باپیـر | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پ | (4) |
| 1 + | 3 = | |

ئە لێرە ژنەکە بەشیکی لە چوار برد باپیریش بوە عەصەبە پاشماوەکەی برد.

نمونە(2):

| دایك | ژنی | باپیر | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{3}$ | $\frac{1}{4}$ | پ | (12) |
| 4 + | 3 + | 5 = | |

لێرەدا دایك (4)ی بردو ژنیشی(3) و باپیریش عەصەبەیە پاشماوەکەی برد کە (5)ـە

**32** ئەگەر لقی میراتگری مێی لەگەڵدا بوو شەشێکی وەکو بەشی خۆی دەبات و پاشماوەکەش دەبات وەکو عەصەبە (بالفرض والتعصیب) بە مەرجێ باوکی مردووی لەگەڵدا نەبێ.

| نموونە: | کچێك | باپیر | بنچینە |
|---|---|---|---|
| | $\frac{1}{2}$ | ( $\frac{1}{6}$ + پ) | (6) |
| | 3 | ( 2 + 1 ) = | |

لێرەدا کچەکە خاوەن بەشە نیوەی برد کە (3)یە ، باپیریش شەشێکی برد کە (2)وە وەك بەشی دیارکراوی خۆی ، ماوە دوو، ئەویش لای زۆربەی زانایان هەر بۆ باپیر دەگەڕێتەوە وەکو عەصەبە، واتە لێرە بە بەش و بە عەصەبە میراتی گرت .

ـ لە فیقهی جەعفەریدا باپیر لە پلەی دووەمە لەلایەنی باوکڕا بێ یا لە لایەنی دایك، لەبەر ئەوە لەگەڵ منالی نێرو مێی مردوو میرات ناگرن چونکە ئەمانە پلەی یەکەمن .وە باپیری لایەنی باوکی واتە باوکی باوکی باوك لە جێگەی باوکە بۆ میرات گرتن و باوکی دایکیش لە جێگەی دایکە ، ئەگەر پێکەوە بوون هی لایەنی باوکی سێیەك دەبات و هی لایەنی دایکیش شەشێك هەر وەك باوکو دایك پێکەوە بن وایە.

ـ وەك لە پێشدا ئاماژە کرا لەیاسای عیراقیدا لە ماددەی 2\91 باپیر بە کچ حەجب دەبێ ، لەبەر ئەوە لە حالەتی سێیەمدا بەگوێرەی یاسا کچەکە هەموو ماڵەکە دەبات باپیریش هیچ نابات .

## دووەم: باپیر لەگەڵ براو خوشك

باپیر لەگەڵ براو خوشکی مردوودا دوو حاڵەتی هەیە ، لە هەر حاڵەتێکدا شێوەی جۆراو جوری هەیە وەك ئەمەی خوارەوە:

**حاڵەتی یەکەم:** ئەگەر باپیر لەگەڵ براو خوشکەکانی مردوودا بوو دایك و باوکی بوون یا باوکی ، خاوەن بەشی لەگەڵدا نەبوو دەکرێتە سەر پشك لەنێوان سێیەکی میراتەکە و دابەشکردنی بە سەریاندا وەك ببێتە یەکێك لەوان ، ئەگەر سێیەکەی بۆ باشتر بوو سێیەکەکە دەبات ، ئەگەر نا بەشی دابەشکردنی وەکو یەك براکان بۆ باشتر بوو ئەویان دەبات، واتە کامەی بۆ قازانج ترە ئەمیان دەبات .کەوابوو ئەم حاڵەتە سی شێوەی هەیە.

### شێوەکانی ئەم حاڵەتە:

ا ـ ئەگەر براو خوشکەکانی وەکو نەفەری میراتگر لە دووئەوەندەی ئەو کەمتر بوون ، لەگەڵ ئەوانا بە برا بژمێردرێ لە دابەشکردنەکەدا وەکو ئەوان وەربگرێ بۆی باشترە . وەك ئەم پێنج نمونانەی خوارەوە:

1ـ باپیر و خوشکێك |دوو بۆ باپیر یەکیش بۆ خوشك وەك براو خوشکێك ، واتە ماڵەکە دەکرێتە سێبەش.

2ـ باپیر و دوو خوشك |لیرەدا دوو بۆ باپیر دوانیش بۆ خوشکەکان یەکەو یەکیان وەك براو دوو خوشك، واتە ماڵەکە دەکرێتە چوار بەش.

3ـ باپیر و سێ خوشك |لێرەش دوو بۆ باپیرەو سیانیش بۆ خوشکەکان یەکەو یەکیان، واتە ماڵەکە دەکرێتە پێنج بەش .

4- باپیر و برایەك | بەشێك بۆ باپیر و بەشێکی تر بۆ براکە ، واتە ماڵەکە دەکرێتە دوو بەش.

5- باپیر و برایەك و یەك خوشك| لێرەشدا دوانی بۆ باپیرو دوانیشی بۆ براکە و یەکیش بۆ خوشکەکە .واتە ماڵەکە دەکرێتە پێنج بەش .

ب ـ ئەگەر دووئەوەندەی باپیر بوون دابەش کردن و سێیەك وەکو یەکە ، وەك ئەم سێ نمونانەی خوارەوە:

1- باپیر و دووبرا |ماڵەکە دەکرێتە سێ بەش یەکو یەکیکیان.

2- باپیر و برا و دوو خوشك |ماڵەکە دەکرێتە شەش بەش دوانیان بۆ باپیر و دوانیان بۆ براو دوانیان بۆ خوشکەکان هەر خوشکە یەکیکیان بەردەکەوێ .

3- باپیر و چوار خوشك | ماڵەکە دەکرێتە شەش بەش، دوانیان بۆ باپیرو چواریشی بۆ خوشکەکان هەریەکەی یەکیکیان .

ج ـ ئەگەر ژمارەی براوخوشکەکان پتر بوون لە دوو ئەوەندەی باپیر سێیەکی بۆ باشترە لە بەشی دابەش کردن چونکە پترە ، وەك : باپیر لەگەڵ سێ براو پتر، یالەگەڵ پێنج خوشك و پتر ، یا لەگەڵ دوو براو خوشکێك .....هتد[110].

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر خاوەن بەشی تر لەگەڵ باپیرو براو خوشکا هەبوون ! باپیر دەبێتە سەر پشك لەنێوان دابەشکردن و شەشێك و سێیەکی پاشماوەی دوای خاوەن بەشەکان کە بەشی خۆیان دەبەن . ئەم حاڵەتەش ڕێسایەکی دیاری نیە بۆ زانینی ئەوەی کامەی پترە ، هەتا مەسەلەکان لێکنەدرێنەوە و ئەنجامیان لە دڵدا دیار نەکرێ . وەك ئەم نمونانەی خوارەوە :

110 ) ئەم شێوەیە نمونەکانی سنور دار نیەو ناژمێردرێن .

نمونەی(1): کە شەشێکی بۆ باشترە:

| مێرد | کچی کور | باپیر | برای دایکو باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | (12) |
| 3 + | 6 + | 2 + | 1 = | |

لێرەدا بینیمان کە شەشێکی بۆ باشتر بوو لە هاوبەشی برایەکە ، چونکە ئەو دووی برد براکەش تەنیا یەك .

نموونەی(2): کە هاوبەشی وەکو برا بۆ باشترە :

| ژنێك | باپیر | خوشکیکی دایکو باوکی | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | {پ (3)} | | (4) |
| 1 + | 2 + | 1 = | |

لێرەدا باپیر بووە برای خوشکەکە لە سەر ڕێسای( للذكر مثل حظ الأنثيين )دوو بەشی برد کچەکەش یەك .

نموونەی(3): کە سێیەکی پاشماوەی بۆ باشترە .

| داپیر | باپیر | (10) برا | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | پاشماوە $\frac{1}{3}$ | پاشماوە | (6) |
| 1 + | | (5) = | 3 ×6= (18) بنچینەی نوو |
| 3 + | 5 + | 10 = | |

لێرەدا سێیەکی پاشماوەی بۆ باشترە لە هاوبەشی براکان بە یەکسانی ، بەڵام لەبەر ئەوەی پێنج سێیەکی نیە بنچینەی مەسەلەکەمانکە (6) بوو لە (3) ماندا بوو بە (18) ، (3) بۆ دایك ماوە (15) سێیەکی پانزە کە دەکاتە (5) بۆ باپیر ماوە(10)ش بۆ براکان هەریەکەیان یەك.

ـ لە فیقهی جەعفەریدا:

1ـ باپیرو داپیر وبراو خوشك و منداڵەکانیان بە نێرو مێیەوە لە پلەی دووەم دەژمێردرێن، نە باپیر بارنجی ئەوان دەکات و نە ئەوانیش بارنجی باپیر دەکەن، بەڵکو میراتەکەیان لەنێواندا دابەش دەکرێ ، ئەگەر میراتگری پلەی یەکەمیان لەگەڵدا نەبێ .

2ـ منالآنی براو خوشك بە نێرو مێیەوە جێگەی باوك و دایکیان دەگرنەوە بۆ میراتگرتن، واتە کوڕوکچی برا میراتی باوکیان دەبەن، کوڕو کچی خوشکیش میراتی دایکیان دەبەن ، جا براو خوشکەکان لە باوکو دایکی بن یا تەنیا لەباوکی بن یا تەنیا لە دایکی بن .

# { بەشی سێیەم}

## ﴿خزمەکانی پشت(عەصەبەکان) و چۆنیەتی میرات گرتنیان﴾

مەبەست لە عەصەبە خزمەکانی پشتی نێرو ئەوانەی وەکو ئەوان دەژمێردرێن لە مێیەکانا .خزمی پشتیش ئەوەیە خزمایەتیەکەی بە هۆی پیاو بگاتەوە یەك، پیاو بێ یا ژن.وەك کوڕو کچ و براو خوشك و باپیری باوکی و ئامۆزاو ...هتد ، بەلاَم ئەگەر بە هۆی ژن بگەنەوە یەك پێی دەڵێن خزمی زگ (ذووا الأرحام) واتە خاوەن ڕەحمەکان .

ئەوەی شایەنی باسە ژنی بە تەنیا خاوەن بەشە نابێتە پشت بەگوێرەی شەریعەت ئەگەر کەسی تری لەگەڵدا نەبێ .

تایبەتمەندی خزمی پشت ( عەصەبە) ئەوەیە پاشماوەی میرات دەبات ئەگەر لەگەڵ خاوەن بەشاندابوو ، هەموو میراتەکە دەبات ئەگەر کەسی لەگەڵدا نەبوو. ئەگەر زۆر بوون میراتەکە لەنێوانیاندا دابەش دەکرێ لەسەر ڕێسای ( للذكر مثل حظ الأنثيين ) ، بەلاَم ئەگەر خاوەن بەشەکان هەموو سامانەکەیان برد هیچ نابات چونکە هیچی بۆنامێنێتەوە . هەروەها خزمی پشت یاخۆی خزمی پشتە یا بەهۆی یەکێکی تر یا لەگەڵ یەکێکی تر بۆیە خزمی پشت سێ جۆرە:

1. خزمی پشتی سەربەخۆ ( العصبە بالنفس): ئەو جۆرە نێرمیە کە تەنیا بەهۆی مێ ناگەڕێتەوە بۆ مردوو بەڵکو یا بە خودی خۆی دەگەڕێتەوە مردوو وەك کوڕ یا بە بەهۆی نێرو مێیەك وەك برای باوك و دایکی یا تەنیا بەهۆی نێرێك وەك کوڕی

کوڕ یا برای لە باوك . ئەمەش سێ جۆری هەیە هەندێکیان لە هەندێك لە پێش ترن بۆ میراتگرتن ، وەك:

أ ـ **کوڕایەتی:** بریتیە لە کوڕی مردوو و کوڕی کوڕی مردوو و بەرەو خوار دەگرێتەوە.

ب ـ **باوکایەتی:** بریتیە لەباوکی مردوو و باوکی باوکی و بەرەو هەوراز واتە هەموو باپیرەکانی پشت گرێتەوە.

ج ـ **برایەتی:** بریتیە لە برایەکانی مردووی باوك و دایکی و باوکی و منالەکانیان هەروەها منالی منالیان و بەرەو خوار دەگرێتەوە.

د ـ **مامایەتی:** بریتیە لە مامی (باوکو دایکی) مردوو و مامی (باوکی) و مامی باپیری پشتی(عەصەبی) و بەرەو سەرەوە ، هەروەها کوڕەکانیان و کوڕانی کوڕانیان و بەرەو خوارەوە .

2ـ **خزمی پشت بەهۆی یەکی تر:** بریتیە لە هەر مێیەکی کە خاوەن بەشە(صاحب فرض) کە پێویستی بە خزمی پشتی نێر هەیە بۆ میراتگرتن بە پشتایەتی( بالتعصیب) ئەگەر لەگەڵیدا کۆ بووەوە بە پشتایەتی (عەصەبە) میراتی لەگەڵدا دەگرێ، لە سەر ڕێسای ( للذکر مثل حظّ الأنثیین ). ئەمانەش چوار جۆرن:

أ ـ کچی پشتی (دایکوباوکی) ئەگەر لەگەڵ کوڕ واتە براکەی کۆ بووەوە .

ب ـ کچی کوڕو کچی کوڕی کوڕو بەرەو خوار هەریەك لەوان ئەگەر لەگەڵ براکانیان کۆ بوونەوە .

ج ـ خوشکی باوك و دایکی ئەگەر لەگەڵ برای باوك و دایکیدا بوو .

د ـ خوشکی باوکی ئەگەر لەگەڵ برای باوکی دا بوو .

3 ـ خزمی پشت لەگەڵ هی تر (العصبە بالغیر):بریتیە لە هەر مییەك پێویستی بە مێیەکی تر هەبێ بۆ میراتگرتن بە پشت بەلاّم ئەوەی تر لەگەڵیا میرات بە پشت ناگرێ بەلاّم بە بەش ! ئەمەش دوو جۆرە :

أ ـ خوشکی باوك و دایکی مردوو ئەگەر لەگەڵ کچی مردوو یا کچی کچی کۆ بووەوە .

ب ـ خوشکی مردوو لە باوکیرا ئەگەر لەگەڵ کچی مردوو یاکچی کوڕی کۆ بوەوە .

ـ لای فقهی جەعفەری: براو خوشکان لە پلەی دووەمن و کچو کچی کوڕ لە پلەی یەکەمن .ئەوەی پلەی یەکەمین بێ هی دووەم حەجب دەکات ومیراتی لەگەڵ ناگرێ ، کەوابوو میراتگرتن بە عەصەبە بە هەموو جۆرەکانی لای وان نیە .بەلاّم بە فەرزو بە خزمایەتیە کە ئەیکەنە سێ پلە:

پلەی یەکەم: کە بریتیە لە دایك و باوك و منالّ و منالّی منالّ .

پلەی دووەم : بریتیە لە باپیرو داپیرو خوشك و براو منالّەکانیان .

پلەی سێیەم : مامەکان و خالەکان و پورەکانی لە هەردوولا[111] و منالەکانیان .

لێرەدا هەر پلەیەکی پێشتر پلەی پاشتر بێبەش(حەجب) دەکات .

ـ ماددەی 2\91 ی هەموار کراو لە یاسای بارەکانی کەسایەتی دەقی لەسەر ئەوەیە کە هەموو میراتگرەکان بە کچ بێبەش دەبن تەنیا دایك و باوك و ژن و مێردو کوڕی مردوو نەبێ .

111 ) واتە خوشکی باوکو خوشکی دایك .

# { باسی یەكەم }

## ﴿ میراتگرتن بە كوڕایەتی ﴾

كوڕایەتی: كوڕی مردووو كوڕی كوڕی و بەرەو خوارەوە دەگرێتەوە .

### یەكەم: ( میراتی كوڕ )

خوا لە سورەی نیسادا فەرمویەتی:( يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ) .واتە خوا فەرمانتان پێ دەكات لە میراتگرتنی منداڵەكانتانا بۆ هەر كوڕێك دوو ئەوەندەی كچە ، واتە ئەگەر پێكەوە بوون دووبەش بۆ كوڕەو بەشێك بۆ كچە .

میراتگرتنی كوڕ ئەم حاڵەتانەی خوارەوەی هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** ئەگەر یەك كوڕ بەتەنیا بوو كەسی لەگەڵدا نەبوو هەموو میراتەكە دەبات .

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر لەیەك پتر بوون و میراتگری تریان لەگەڵدا نەبوو وەك دوو بن یاسێ یا چوار یاپتر ، هەموو میراتەكە دەبەن لەنێوانیانا بەیەكسانی دابەش دەكرێ .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر لەگەڵ كچەكان بوون (واتە خوشكەكانیان) میراتەكە لەسەر بنەمای ( للذكر مثل حظ الأنثيين ) لە نێوانیاندا دابەش دەكرێ .

وەك: یەكێك بمرێ سێ كوڕو دوو كچی هەبێ . میراتەكە دەكرێتە (8) بەش ، شەشی بۆ كوڕەكان هەریەكە دوو بەش دوانیشی بۆ كچەكان هەریەكە بەشێك .

**حالەتی چوارەم:** ئەگەر کوڕ لەگەڵ مایراتگرەکانی خاوەن بەشدا بوون پاشماوەی میراتەکە دەبەن لەنێواندا لەسەر ڕێسای( للذكر مثل حظ الأنثيين ) دابەش دەکرێ .

وەك ئەم میراتگرانەی خوارەوە:

نموونە(1):

| مێرد | 3کوڕ | بنچینەی مەسەلە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پ | (4) |
| 1 + | 3 = | |

لێرەدا مێردەکە یەکی برد ماوە سێ بۆکوڕەکان هەریەکەی یەکێك .

نموونە(2):

| ژن | کوڕێك | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | پ | (8) |
| 1 + | 7 = | |

یەك بۆژنەکە ماوە حەوتیش بۆ کورەکە .

نموونە(3):

| مێرد | کوڕێك | کچێك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | (پ(3)) | | (4) |
| 1 + | 2 + | 1 = | |

مێردەکە یەکێکی برد ماوە سێ دوویان بۆ کوڕەکەو یەکیکیشیان بۆ کچەکە.

**حالەتی پێنجەم:** جیای ئەم خاوەن بەشانە ( دایکو باوك، ژن ومێرد، باپیرو داپیر، کچی مردوو) لەگەڵ کوڕا میرات ناگرن . وە ك ئەم میراتگرانە:

| 5کوڕ | دووخوشکو برایەك |
|---|---|
| هەموو | هیچ(بارنجن) |

لیرەدا کوڕەکانی مردوو هەموو میراتەکە دەبەن بەیەکسانی لە نێوانیاندا دابەش دەکرێ، بەڵام براو خوشکەکانی بێ بەشن و هیچ نابەن چونکە بەکوڕەکان بارنج دەبن .

**بەهێزی خزمایەتی کوڕ:**

1ـ هەموو خزمەکان بارنج (حەجب) دەکات تەنیا ئەم حەوت چینە نەبێ: باوك ، دایك ، مێرد ، ژن، باپیر ، داپیر ، کچی مردوو .

2ـ بەشی دایك لە سێیەك بۆ شەشێك و بەشی ژن لە چواریك بۆ هەشتێك و بەشی مێرد لە نیوە بۆ چاریك کەم دەکاتەوە ، کە پێی دەڵێن (حجب جزئی).

3ـ کوڕ بە هیچ میراتگرێك بارنج نابێت واتە بێ بەش نابێت .

## دووەم: (میراتی کوڕی کوڕ)

ئەگەر کوڕ نەبوو کوڕی کوڕ جێگەی کوڕ دەگرێتەوە واتە هەمان میراتی ئەو دەگرێت تەنیا لەم حالەتانەی خوارەوە نەبێ:

**حالەتی یەکەم** : ئەگەر لەگەڵ کچی کوڕا بوو یەك بوو یاپتر نایانکاتە پشت (عصبە) بەڵام پاشماوەی میراتەکە دەبات پاش بەشی کچەکە یا کچەکان . وەك:

نموونە(1):

| کچێك | کوڕێکی کوڕ | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | پ | (2) |
| 1 | + 1 = | |

لێرەدا کچەکە بەشی خۆی برد کە یەکە ، ماوە یەك بۆ کوڕی کوڕ.

نموونە(2):

| 2کچ | کوڕی کوڕ | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{2}{3}$ | پ | (3) |
| 2 | + 1 = | |

**حالەتی دووەم:** کوڕی کوڕ کچی مامی خۆی دەکاتە عەصەبە میراتەکە لەنێوانیاندا لەسەر ڕێسای(للذکر مثل حظ الإنثیین) دابەش دەکرێ. وەك: کچێکی کوڕ لەگەڵ کوڕێکی کوڕی تر، میراتەکە دەکرێتە سێ بەش کوڕەکە دووبەش دەبات

وکچەکەش یەك بەش .

**حاڵەتی سێیەم:** کوڕی کوڕی کوڕ کچی کوڕ دەکاتە عەصەبە کە لەو دوورترە لە مردوو.وەك :

| 2کچ | کچێکی کوڕ | کوڕی کوڕی کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{2}{3}$ | ( پ ) | | (3) |
| 2 | + 1 = | | 3×3= (9) بنچینە پاش چاکردنەوەی مەسەلە |
| 6 | + 3 = | | |

بەڵام لەبەر ئەوەی (1) بە بێ کەرت دابەش ناکرێتە سەر کچی کوڕو کوڕی کوڕەکە؛ دەبێ بنچینەی مەسەلەکە کە (3)یە لە(3) بدەین تا ببێتە (9) لە بەشەکانیش بدەین ،جا دەبێتە شەش بۆ کچەکەو پاشماوەکەشی کە سێیە بۆ ئەوانی تر، دووی بۆ کوڕەکەی کوڕو یەکێکیش بۆ کچەکەی کوڕ .

لە یاسادا کچی کوڕ ئەوانی خوارووی خۆی بارنج (حەجب) دەکات لەگەڵیا میرات ناگرن ، ئەمەش لەسەر بۆچوونی فقهی جەعفەری ، لەبەر ئەوە لە حاڵەتی یەکەم و سێیەمدا نەوەکان بەکچ و کوڕەوە هیچ نابەن . هەموو میراتەکە تەنیا بۆ کچە، یەك بێ یا پتر .

بەڵام بۆچوونی (جمهور) ڕاست ترە؛ چونکە قورئان لەباسی کچاندا لەوەی پتر بۆ دانەناون ، کەوابوو دادوەری ئەوەیە کە پاشماوەکە بۆ نزیك ترین خزم بێ کە لێرە نەوەکانن .

# { باسی دووەم }

## ﴿ میراتگرتن بە باوکایەتی ﴾

باوك لەلایەكا خاوەن بەشەو لەلایێكی تریشەوە عەصەبەیە ، بەڵام وەكو خاوەن بەش لەپێشدا باس كرا ، ئێستاش وەكو عەصەبە باسی دەكەین:

باوكایەتی بریتیە لە باوك و باپیرو باوكی باوك و بەرەو سەرەوە . بەڵام باوكی دایك و، باوكی دایكی باوك بەخاوەن ڕەحم دەژمێردرێن .وەك لەپێشدا باس كرا باوكایەتی دوای پلەی كوڕایەتی دێت و ئەم حالەتانەی خوارەوەی هەیە:

1ـ ئەگەر كوڕی مردووی لەگەڵدا بێت دەبێتە خاوەن بەش شەشێك دەبات ، بەڵام ئەگەر كوری لەگەڵدا نەبێت دەبێتە عەصەبە یا پاشماوەی میراتەكە دەبات ئەگەر خاوەن بەشی لەگەڵدا بوو ، یا هەموو میراتەكە دەبات ئەگەر كەسی لەگەڵدا نەبوو .

2ـ باوك براو خوشكەكانی مردوو بارنج (حەجب) دەكات بەڵام باپیر حەجبیان ناكات و میراتی لەگەڵا دەگرن تەنیا لای ئیمامی حەنەفی نەبێ ئەویش حەجبیان دەكات .

3ـ لای زۆربەی زانایان باوك سێیەكی دایك كەم دەكاتەوە بۆ سێیەكی پاشماوە پاش میراتی ژن یا مێرد ئەگەر باوك و دایك و یەك لەهاوسەرەكانیان لەگەڵدا بوو وەك لەپێشوودا باس كرا. بەڵام باپیر كەمی ناكاتەوە بەڵكو دایك لەگەڵ باپیردا لەم حالەتەدا سێیەكی میرات دەبات .

4ـ دایكی باوكی مردوو بە باوكی مردوو بارنج (حەجب) دەبێت.بەڵام لەگەڵ باپیرا میرات دەگرێ چونكە ژنیەتی و لەهەمان پلەی خزمایەتیە لەگەڵ مردووەكە.

ـ لەبەر ئەوەی نموونەكان لەپێشدا باسكراوە پێویست نیە لێرە دووبارە بكرێتەوە .

# { باسی سێیەم }

## ﴿ میرات گرتن بە برایەتی ﴾

برایەتی ئەم حالەتانەی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** پلەی برایەتی پاشی پلەی کوڕایەتیە واتە ئەگەر مردوو کوڕی هەبوو یا کوڕی کوڕو کوڕو بەرەو خوارەوە برا هیچ میرات ناگرێ تەنیا برای دایکی نەبێ کە کەلالەیەو خاوەن بەشە، هەروەها برایەتی پاش پلەی بابایەتیشە واتە ئەگەر مردووەکە باوکی هەبوو لەگەڵ برا ، براکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە بارنج دەبن و هیچ نابەن ، وەك:

| نموونە(1): | میرد | کوڕ | (2)برا | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| | $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (بارنجن) | (4) |
| | 1 + | 3 + | هیچ = | |

| نموونە(2): | ژنێك | باوك | 2برا | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| | $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | بارنجن | (4) |
| | 1 + | 3 + | هیچ = | |

**حالەتی دووەم:** برایەتی چەند پلەیەکی هەیە ، پلەی پێشتر پلەی پاشتر بارنج (حەجب) دەکات ، پلەکانی برایەتیش ئەمانەن :

1ـ برای لە دایك و باوك (الأخ الشقيق) .

2ـ برای تەنیا لە باوك ( الأخ من الأب).

3ـ كوڕی برای لە دایكوباوك و بەرەوخوارەوە .

4ـ كوری برای لە باوك بەرەو خوارەوە .

| | | |
|---|---|---|
| نمونە(1): | **برای لە دایكوباوك** | **برای لە باوك** |
| | هەموو مالەكە دەبات | بارنجە هیچ نابات |

| | | |
|---|---|---|
| نمونە(2): | **كوری برای لە دایكو باوك** | **كوڕی برای ە باوك** |
| | هەموو | هیچ(بارنجە) |

**حالەتی چوارەم:** هەریەك لەوان ئەگەر پلەی پێشی خۆی بارنجكەری لەگەڵدا نەبوو ئەگەر بەتەنیا بوو هەموو میراتەكە دەبات ، ئەگەر خاوەن بەشیشی لەگەڵدا بوو پاشماوەی میراتەكە دەبات.

| | | | |
|---|---|---|---|
| نموونە: | **ژنێك** | **برای (د.ب)** | **بنچینە** |
| | $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| | 1 | + 3 | = |

لێرەدا برایەكە چ برای لە دایكوباوك بێت یابرای لە باوك بێ پاشماوەی بەشی ژنەكە دەبات كە سێیە .

هەر بەم جۆرەش ئەگەر لەجیاتی برا كوڕی برای لە دایكو باوك یاكوری برای لە باوك بێت هەر پاشماوەكەی دەبات.

**حالەتی پێنجەم:** برای لە دایكو باوك خوشكەكەی دەكا بە عەصەبە ، هەموو میراتەكە یا پاشماوەكەی لەنێوانیاندا دابەش دەكرێ لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ

الأنثيين). بە هەمان شێوە ئەگەر برای لەباوك لەگەڵ خوشکی لەباوکا کۆ بووەوە دەیکا بە عەصەبە . بەڵام کوڕی برای لەدایکوباوك و کوڕی برای تەنیا لە باوك خوشککەکانی خۆیان ناکەن بە عەصەبە چونکە کچی برا لای زۆربەی زانایان بە خاوەن ڕەحم دەژمێردرێ . وەك:

| ژنێك | برای لەدایکو باوك | خوشکی لە دایکو باوك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە(3) | | (4) |
| 1 + | 2 + | 1 = | |

لیرەدا ژنەکە یەك بەشی برد ماوە سیان، دوانیان بۆ براکەو یەکیکیشی بۆ خوشکەکە. ئەگەر لێرەدا برای باوکی یا لەگەڵ خوشکی باوکی بە هەمان شێوە دەبوو.

**حاڵەتی شەشەم:** جار وایە بەشەکانی خاوەن بەشەکان گشت میراتەکە دا دەپۆشێ و هیچ بۆ براکانی (ب.د) یا براکانی(ب) نامینێتەوە. وەك:

نموونە(1):

| مێرد | خوشکی لە (ب.د) | برای لە (ب) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{2}$ | بێبەش بوو بە داپۆشتن | (2) |
| 1 + | 1 + | هیچ = | |

لێرەدا برای لە باوك بێبەش بوو چونکە هیچی بۆ نەماوە لەبەر ەوەی بەشەکان گشت میراتەکەیان داپۆشت ، نەك بەبارنـج بوون .

نموونە(2):

| دایك | (2)کچی کور | باپیر | برای(لە ب.د) | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | بێبەش بوو بە داپۆشتن | (6) |
| 1 + | 4 + | 1 + | هیچ = | |

بەهەمان شێوە هیچ بۆ برای لە(ب.د) نەماوە، چونکە بەشەکانی خاوەن بەشەکان گشت میراتەکەیان گرتەوە .

## { باسی چوارەم }

## ﴿ میرات گرتن بە مامایەتی ﴾

مامایەتی لەپلەی دوایی عەصەبەکانە ، واتە ئەگەر مردووەکە کوڕ یاباوك یا یابرای هەبێ مام میرات ناگرێ .

میراتگرتنی مام ئەم حالەتانەی خوارەوەی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** مامایەتی چەند پلەیەکی هەیە ، پلەی پێشتر پلەی پاشتر بارنـج(حجب) دەکات، پلەکانی مامایەتیش ئەمانەن:

1- مامی لە دایکو باوك . 2- مامی لەباوکی. 3- کوڕی مامی لە باوکو دایك. 4- کوڕی مامی لە باوك . وەك ئەم نمونانەی خوارەوە:

نموونە(1):

| ژنێك | مامی لە(ب.د) | مامی لە(ب) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | بارنجە | (4) |
| 1 + | 3 + | هیچ = | |

لێرەدا مامی لەباوكرا هیچی نەبرد چونكە بارنجە بە مامی لە دایكوباوك .

نموونە(2):

| داپیر | مامی لە(ب) | كوڕی مامی لە(ب . د) یا لە(ب) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | پاشماوە | بارنجە | (6) |
| 1 + | 5 + | هیچ = | |

لێرەدا كوری مام بە هەردوو جۆرەوە بارنج دەبێ هیچ وەرناگرێ چونكە پلەكەی پاشی پلەی مامە .

**حالەتی دووەم:** جار وایە بەشەكانی خاوەن بەشان گشت میراتەكە دادەپۆشێ و هیچ بۆ مام نامینێتەوە ، وەك:

| مێرد | خوشكێكی لە( ب) | مامی لە(ب.د) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{2}$ | بێبەش بوو بە داپۆشتن | (2) |
| 1 + | 1 + | هیچ = | |

لێرەدا مامی لە دایك وباوك هیچی بۆنەماوە بەهۆی ئەوەی بەشەکانی خاوەن بەشەکان گشت ماڵەکەی گرتەوە .

**تێبینی:** دوو تێبینی هەیە پێویستە بزانرێ:

1ـ مامی لە باوکو دایك و مامی لەباوك هەردووکیان خوشکەکانی خۆیان (واتە پلکەکانی مردوو) ناکەنە عەصەبە ، بو ئەوەی میراتیان لەگەڵا بگرن ، چەنکە پلك لە خاوەن ڕەحمەکانە ( ذوي الأرحام) واتە خزمی زگە .

2ـ مامی تەنیا لە دایك و منالەکانی بەنێرو مێیەوە لە خاوەن ڕەحمەکانن .

ـ لەفیقهی جەعفەریدا مامی لە دایکوباوك و لەباوك لە پلەی سێیەمن، یا پاشماوەی میراتەکە دەبەن لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) ، بەڵام مامی لەدایك وەکو براو خوشکی لەدایك دەژمێردرێن ، ئەگەر یەك بوو شەشێك دەبات وئەگەر پترbوون بەهەموویان سێیەکی میراتەکە دەبەن بە یەکسانی .

# { بەشی سێیەم }

## ﴿ میراتی خاوەن ڕەحمەکان ( ذوي الأرحام ) ﴾

خوا لەسوڕەی ئەنفالدا فەرموویەتی: (﴿وَأُولُوا الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾(75)).

خاوەن ڕەحم[112] واتە خزمی زگ: بریتیە لەو خزمانەی کە بەڕێی ژن دەگەنەوە یەك و خزمایەتیان بەهۆی ژنە[113]، ئەوانەن کە جیای خاوەن بەش و عەصەبەکانن لە میرات گرتنا .

خاوەن ڕەحمەکان چوار چینن بەگوێرەی لایەنی خزمایەتیان، هەندێکیان لە هەندێکیان نزیك ترن بۆ میراتگرتن ، چینەکانیش ئەمانەن :

**چینی یەکەم:** خاوەن ڕەحمەکانی لقی مردوو کە بریتین لەم چینانە:

1. منداڵەکانی کچی مردوو بەرەو خوارەوە بەنێرو مێیەوە.
2. منداڵەکانی کوڕی کچی مردوو بەرەو خوارەوە بەنێرو مێیەوە .

**چینی دووەم:** خاوەن ڕەحمەکانی ڕەچەلاکی مردوو کە بریتین لەم چینانە:

1. باپیرەکانی ڕەحمی ، وەك: باوکی دایك ، باوکی باوکی دایك و ... بەرەو سەرەوە.

---

112 ) ڕەحم منداڵدانە چونکە بەڕێی ژن دەبێتە خزم پێی وتراوە( أولوا الأرحام) واتە خاوەن ڕەحم ...

113 ) میرات و وصیەت لە شەریعەتی ئیسلام و یاسادا ، د. احمد محمد گەزنەیی ص129 .

2ـ داپیرەکانی ڕەحمی ، وەك:دایکی باوکی دایك ، دایکی دایکی باوکی دایك و...بەرەو سەرەوە.

چینیی سێیەم: ئەو خاوەن ڕەحمانەی لە لقەکانی باوك و دایکی مردوون ، واتە منداڵی دەورووبەر کە نەبەبەشی دیارکراو میرات دەگرن نە بەپشت .کە بریتین لەم چینانە:

1ـ کوڕەکانی برای مردوو لەدایکرا بە نێرو مێیەوە .

2ـ منداڵەکانی خوشکی مردوو بە نێرو مێیەوە ، چ خوشکی لە دایك وباوکا بێ یاخوشکی تەنیا لەباوکا بێ یاخوشکی لەدایك .

3ـ کچەکانی برای مردوو ـ برای لە باوك و دایکیا بێ یابرای لەباوك یابرای لەدایك .

4ـ کچەکانی کوڕی برای مردوو ـ برای لە باوك و دایکا بێ یا برای لە باوکا یابرای لەدایك .

چینیی چوارەم: ئەوانەی لقی باپیران و داپیرانی مردوو بن هەرچەند بەرەو سەرەوەبن ، واتە ئەوانەی ئەگەڕێنەوە سەر ڕەچەلاکی مردوو بە مەرجێ نە خاوەن بەش بن نە پشت(عەصەبە).کە بریتینە لەم چینانە:

1 ـ مامەکانی مردوو لەدایکرا و منداڵەکانیان .

2 ـ کچانی مام بە هەموو جۆرەکانیەوە و منداڵەکانیان .

3 ـ پلکەکانی[114] لایەنی باوك و منداڵەکانیان .

4 ـ خاڵەکان و منداڵەکانیان .

114 ) خوشکی دایك و خوشکی باوك هەردوکیان بە زاراوەی سولەیمانی پێی دەڵێن پوور بەزاراوەی ئێمەش پێی دەڵێن پلك ، جا بۆ ئەوەی جیاواز بن و تێکەڵ نەبن پلکم بە خوشکی باوك داناو پووریش بە خوشکی دایك هەتا لێك بکرێنەوە .

5 ـ پورەکانی لایەنی دایك و منالّەکانیان .

شایەنی باسە ئەگەر خاوەن بەش و عەصەبە هەبن خزمی زگ (خاوەن ڕەحم) میرات ناگرن تەنیا لەگەڵ هاوسەرەکانا ( مێردو ژنا) نەبێ چونکە هاوسەرەکان بەکەس حەجب نابن و کەسیش بەوان حەجب نابێ .

**حوکمی میراتی خاوەن ڕەحمەکان:** بۆ دیار کردنی حوکمی میراتگرتنی خاوەن ڕەحمەکان دوو قسە هەیە:

**قسەی یەکەم:** لای ئیمامی عومەرو ئیمامی عەلی ﷺ و حەزرەتی عەبدوللای کوری مەسعودو عبدوللای کوڕی عەباس ﷺ و چەند سەحابەی تر[115] هەروەها لای زۆربەی (جمهوری) زانایان وەك ئیمامی حەنەفی و ئیمامی ئەحمەد و زانایانی پاش چەرخی چوارەمی کوچی لە مالیکیەکان و شافیعیەکان: خاوەن ڕەحمەکان میرات دەگرن ئەگەر خاوەن بەش و عەصەبە نەبن. لەبەر ئەم بەلگانەی خوارەوە:

1ـ فەرموودەی خوا لە سورەی ئەنفالدا: (وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (75)). واتە خزمانی پەیوەندی ڕەحمیان لەنێواندا هەیە بۆ یەکتری لەپێش ترن بۆ میراتگرتن لە بێگانەکانا . لێرەدا ووتیان: کەوابوو خاوەن ڕەحمەکان میرات دەگرن.

2ـ فەرموودەی خوا لە سورەی نیسادا: (لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا(7)) واتە پیاوەکان بەشیان هەیە لەوەی باوك و دایك و خزمەکانیان بەجێی دێلن و ژنەکانیش بەشیان

115 ) تحفة الأحوذي شرح الترمذي 6\236.

هەیە لەوەی باوك و دایك و خزمەکانیان بەجێی دێلن ،لەوەی کە زۆربێ یاکەم بێت، بەشی دیار کراویان هەیە. لێرەدا وشەی پیاوو ژن بەگشتی هاتووە تایبەتمەند نەکراوە بەهیچ جۆرێك ، کەوابوو خاوەن ڕەحمەکانیش دەگرێتەوە بۆ میراتگرتن.

3ـ عن عائشە ﵂ أن النبی ﷺ قال: (الخال وارث من لا وارث لە)[116] .

واتە لە حەزرەتی عائیشەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (خاڵ میراتگری ئەو کەسەیە کە میراتگری نیە) .

خالیش خاوەن ڕەحمە ، کەوابوو خاوەن ڕەحمەکان میرات دەگرن.

قسەی دووەم: لای حەزرەتی زەیدی کوڕی سابت خزمی زگی میرات ناگرێ ، ئەگەر خاوەن بەش و عەصەبە نەبوون ماڵەکە دەچێتە خەزنەی دەولەت . ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعیش ئەم بۆچونەیان لا پەسندە . چونکە هیچ دەقێکی ڕاستەوخۆ لە قورئانێدا باسی ئەوانی نەکردووە بۆ میرات گرتن .

بەڵام زانایانی دوای ئەوان لە دواکەوتوی هەردووکیان وتوویانە ئەگەر خەزنەی دەولەت ڕێك نەبێ خاوەن ڕەحمەکان میرات دەگرن[117].

---

116 ) سنن الترمذي 4\422 الحديث رقم 2104 وقال حديث حسن غريب.

117 ) مەبەست لەرێکی خەزنەش ئەوەیە بەرێی شەرعی مالی دەسکەوت بکاو و بە دادوەری ورێی شەرعیش خەرجی بکات .

# { باسی یەکەم }

## ﴿ میراتی چینی یەکەم ( منداڵەکانی کچ و منداڵەکانی کچ وکوڕ)﴾

منداڵی کچ و منداڵی کچی کوڕ بە جۆرەی ئەم حاڵەتانەی خوارەوە میرات دەگرن:

**حاڵەتی یەکەم:** ئەگەر تەنیا یەك منداڵ بوو ( نێر بێ یامێ) کەسی تری لەگەڵا نەبوو، هەموو میراتەکە دەبات.وەك:

| 1ـ کچی کوڕ | 2ـ کچی کچ | 3ـ کوڕی کچی کوڕ |
|---|---|---|
| هەموو | هەموو | هەموو |

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر یەك لە هاوسەرەکانی لەگەڵدا بوو پاشماوەی میرات دەبات:وەك:

نموونە(1):

| ژن | کچی کچ | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| 1 | + 3 | = |

نموونە(2):

| مێرد | کوڕی کچ... یا کوڕی کچی کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (2) |
| 1 | + 1 | = |

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر لەیەك زیاتر بوون و یەكسان بوون لە پلەی خزمایەتی و پەیوەندی بە مردوو میراتەكە لەنیوانیاندا دابەش ئەكرێ بە یەكسانی ئەگەر تەنیا كور بوون یا تەنیا كچ بوون ، ئەگەر پێكەوەش بوون لەسەر ڕێسای (للزكر مپل حف الّنپیین) لە نێواندا دابەش ئەكرێ .وەك:

نموونە(1): پێنج كوڕی كچ | ماڵەكە دەكرێتە پێنج بەش هەریەكەی بەشێك.

نموونە(2): سێ كچی كوڕ | ماڵەكە دەكرێتە سێ بەش هەر یەكیان بەشێك .

نموونە(3):

| ژن | (3) كچی كوڕ | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| 1 | + 3 | = |

نموونە(4):

| كچی كچی كچ | كوڕی كچی كچ |
|---|---|
| 1 | 2 |

ماڵەكە دەكرێتە سێ بەش لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) دوو بۆ كوڕەكەو یەكیش بۆ كچەكە .

**حاڵەتی چوارەم:** ئەگەر لەیەك پتر بوون بەڵام پلەی خزمایەتیان جیاواز بوو ، كامەیان لەپێشترە ئەویان میرات دەگرێ كوڕ بێ یاكچ ، هی دوور تر بارنج دەبێت ، وەك:

نموونە: <u>کچی کچ</u> <u>کوڕی کچی کوڕ</u>

هەمووو هیچ(بارنجە)

**حاڵەتی پێنجەم:** ئەگەر لەیەك پتر بوون و لە پلەی خزمایەتی وەکو یەك بوون بەڵام لە پەیوەندی خزمایەتی جیاواز بوون ، ئەوەی پەیوەندی بە هۆی خاوەن بەش بێ لەپێشترە لە وەی پەیوەندی بە هۆی خاوەن ڕەحمە. وەك:

نموونە: <u>کچی کچی کوڕ</u> <u>کوڕی کوڕی کچ</u>

هەموو هیچ (بارنجە)

لێرەدا کچی کوڕ خاوەن بەشە بۆیە کچەکەی پێشکەوت لەمیراتا ، بەڵام کوڕی کچ خاوەن ڕەحمە بۆیە کوڕەکەی بارنج بوو.

ـ لە فیقهی جەعفەریدا مناڵانی کچ و مناڵی مناڵیان و بەرەو خوار هەروەها مناڵی کچی کوڕو مناڵی مناڵیان و بەرەو خوار بەکوڕو کچەوە جێگەی نەژادەکانیان(ئەصلەکانیان) دەگرنەوە بۆ میرات گرتن، ئەگەر نەمابوون هەمان میراتی نەژادەکانیان دەگرن ئەگەر لەژیاندا بان . چونکە مناڵ و مناڵی مناڵ و بەرەو خوار بە کوڕو کچەوە لەپلەی خزمایەتی یەکەمن پێش هەموو میراتگرەکان دەخرێن تەنیا باوك و دایك نەبێ . ئەگەر پلەی خزمایەتیان جودا بوو هی پێشتر میرات دەگرێ و هی پاشتر بێبەش دەبێ .

## { باسی دووەم }

## ﴿ میراتی باپیری خاوەن ڕەحم و داپیری خاوەن ڕەحم ﴾

ئەگەر میراتگری خاوەن بەش نەبوو (جگە لە یەك لە هاوسەرەكان)، هەروەها ئەگەر میراتگری جۆری یەكەم لەخاوەن ڕەحمەكانا نەبوون باپیرو داپیری ڕەحمی بەگوێرەی ئەم ڕێسایانەی حالەتانەی خوارەوە میرات دەگرن:

**حالەتی یەكەم:** ئەگەر باپیری ڕەحمی یا داپیری ڕەحمی بەتەنیا بوو هەموو میراتەكە دەبات یا پاشماوەكەی دوای بەشی یەك لە هاوسەرەكان ئەگەرهەبوو. وەك:

| ژنیك | باپیر(باوكی دایك) | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| 1 | + 3 = | |

| ژنیك | داپیر(دایكی باوكی دایك) | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| 1 | + 3 = | |

لێرەدا ئەگەر باپیری ڕەحمی یاداپیر بەتەنیابا هەموو میراتەكەی ئەبرد .

**حالەتی دووەم:** ئەگەر لەیەك پتربوون پلەی خزمایەتیان جودا بوو، میراتەكە بۆ پلەی نزیكترینیانە لەلای دایكرا بوو یا لەلای باوك .وەك:

| باپیر(باوکی دایک) | باپیر(باوکی دایکی باوك) |
|---|---|
| هەموو | هیچ (بارنجە) |

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر لەپلەی خزمایەتیدا یەکسان بوون بەڵام جودا بوون لەلایەنی پەیوەندیان بەمردوو (جهة الإدلاء) [118] ، ئەوەی بە هۆی خاوەن بەشی پەیوەندی بە مردوو هەیە لەپێشترە بۆ میراتگرتن لەوەی پەیوەندی بەهۆی خاوەن ڕەحمیە. وەك:

| ژنێك | باپیر(باوکی دایکی دایك) | باپیر(باوکی باوکی دایك) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوەکە | بارنجە | (4) |
| 1 + | 3 + | هیچ = | |

لێرەدا چونکە دایکی دایك خاوەن بەشە بۆیە باوکەکەی میراتەکەی برد، بەڵام باوکی دایك خاوەن ڕەحمە بۆیە بارنج بوو .

**حاڵەتی چوارەم:** ئەگەر باپیرەکانی ڕەحمی لەپلەی خزمایەتی ولایەنی پەیوەندیەکەی وەکو یەك بوون، وەك هەموویان لەلایەنی باوکڕابن، یا هەموویان لا لەلایەنی دایکڕابن ، هەموویان لە میراتەکەدا دەبنە هاوبەش لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين).

118 ) إدلاء مانای نزیك بوونەوە و شۆڕبونەوەیە بۆ مردوو، بەڵام مەبەستی لێ پەیوەندی خزمایتیە ، بۆیە پەیوەندیم بەکار هێنا .

نموونە(1): <u>باپیر(باوکی باوکی دایك)</u> <u>داپیر(دایکی باوکی دایك)</u> <u>بنچینە</u>

2 1 (3)

لێرەدا ماڵەکە دەکرێتە سێ بەش دوویان بۆ باوکی باوکی دایك سێشیان بۆ دایکی باوکی دایك. لەسەر ڕێسای: (للذكرمثل حظ الأنثيين) .

نموونە(2):

<u>ژنێك</u> <u>باپیر (باوکی باوکی دایکی باوك)</u> <u>داپیر(دایکی باوکی دایکی باوك)</u> <u>بنچینە</u>

$\frac{1}{4}$ (3) پ (4)

1 + 2 + 1 =

**حالەتی پێنجەم:** ئەگەر لە پلەی خزمایەتی و لایەنی پەیوەندی وەکو یەك بوون بەڵام لایەنی خزمایەتیان جودابوو ، ئەوەی لەلایەن باوکراخزمە دوو سێیەك دەبات و ئەوەی لەلایەن دایکیشرایە سێیەکیك دەبات. واتە هەر یەکە بەشی لایەنی خۆی دەبات کە ماڤ بوو ئەگەر لەژیاندابا ، وەك:

<u>ژنێك</u> <u>باپیر (باوکی دایکی باوك)</u> <u>باوکی دایکی دایك</u> <u>بنچینە</u>

$\frac{1}{4}$ (3)پ (4)

1 + 2 + 1 =

# { باسی سێیەم }

## ﴿ میراتی مناڵی دەوروبەر( أولاد الحواشى )﴾

ئەگەر هیچ میراتگری عەصەبەو خاوەن بەش(جیای یەك لە هاوسەرەکان)نەبوو، هەروەها میراتگری جۆری یەکەم و دووەم لەخاوەن ڕەحمەکانا نەبوو، ئەوجا مناڵی دەورووبەر(واتە مناڵی براو خوشك و بەرەو خواریان) میرات دەگرن بەگوێرەی ڕێساکانی ئەم حالەتانەی خوارەوە:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر تەنیا یەك مناڵ بوو هەموو میراتەکە دەبات یا پاشماوەکەی یەك لە هاوسەرەکان ئەگەر هەبوو دەیبات: وەك:

| ژن | کچی خوشك | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوەکە | (4) |
| 1 | + 3 | = (4) |

| مێرد | کچی برا | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (2) |
| 1 | + 1 | = (2) |

**حالەتی دووەم:** ئەگەر لەیەك پتر بوون و پلەی خزمایەتیان جودا بوو کامەی پلەی نزیکترە لە پێشترە بۆ میراتگرتن هی دوورتر بارنج دەکات .وەك:

| کچی برا دایکی | کچی کوڕی برای دایکو باوکی |
|---|---|
| هەموو | هیچ (بارنجە) |

**حالەتی سێیەم:** ئەگەر پلەیان وەکو یەك بوو ئەوەی پەیوەندیەکەی بە هۆی کوڕی پشتی(عەصەبە)یە لەپێشترە لەوەی پەیوەندی بەهۆی کوڕی ڕەحمیە. وەك:

| کچی کوڕی برای دایکو باوکی | کوڕی کچی برای دایکو باوکی |
|---|---|
| هەموو | هیچ (بارنجە) |

**حالەتی چوارەم:** ئەگەر یەکسان بوون لە پەیوەندی بە هۆی عەصەبە یانەبوونی پەیوەندی بە هۆی عەصەبە ، میراتەکە بۆ ئەوکەسەیە کە خزمایەتی بەهێز ترە.وەك:

نموونە(1):

| کچی برای دایکو باوکی | کچی برای باوکی |
|---|---|
| هەموو | هیچ (بارنجە) |

نموونە(2):

| ژن | | کچی برای باوکی | | کچی برای دایکی | | بنچینە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | | پاشماوە | | (بارنجە) | | (4) |
| 1 | + | 3 | + | هیچ | = | (4) |

# { باسی چوارەم }

## ﴿ میراتی چینیی چوارەم لە خاوەن ڕەحمەکان ﴾

ئەم جۆرە بریتیە لەو خاوەن ڕەحمانە کە پێك دێن لە شەش پلە بەم جۆرەی خوارەوە[119] .

1ـ **پلەی یەکەم:** بریتیە لە مامەکانی دایکی و پلکەکان وخالەکان و پورەکانی دایکوباوکی یا تەنیا دایکی[120] .

2ـ **پلەی دووەم:** منداڵەکانی پلەی یەکەم بە نێرو مێیەوە . لەگەڵ کچی مامی باوکودایکی یا تەنیا باوکی و کچەکانی کوڕیان و بەرەو خوارەوە و منالی ئەم کچانەو بەرەو خوارەوە.

3ـ **پلەی سێیەم:** مامەکانی باوکی مردووی دایکی، پلکەکان و خاڵەکانی، پوورەکانی لەدایکو باوکرا یاتەنیا لەلایەکیانرا ، مامەکانی دایکی مردوو پلکەکان و پوورەکان و خاڵەکانی .

4ـ منالەکانی ئەوانەی پلەی سێیەم بەنێرو مێیەوە ، کچانی مامی باوکی مردووی دایکوباوکی یا تەنیا دایکی ، کچەکانی کوڕانی و بەرەو خوارەوە، منالی ئەم کچانەو بەرەو خوارەوە.

---

119) شرح الرحبية للدمشقي ص 177، 178 .

120) دوو زاراوە هەیە بۆ خوشکی دایکو باوك ، یەکیان بە هەردووکیان دەڵێ پلك ئەوی تریان بەهەردووکیان دەلێ پور، بۆ جیا کردنەوە خوشکی باوکمان ناونا نا پلك و خوشکی دایکمان ناو نا پور، چونکە لەعەرەبیدا جیایە و حوکمەکانیشیان جودایە. بادینیەکان هەر عرەبیەکەیان بەکار هێناوە بە خوشکی دایك دەڵێن خالەت و بە خوشکی باوك دەڵێن مەتێ واتە عەممەت .

5ـ مامەکانی باوکی باوکی مردوو لە دایکرا ، مامەکانی باوکی دایکی مردوو ، پلکەکان و خالەکان و پوورەکانی هەردوولا لە دایکوباوکرا یاتەنیا لەلایەکیانرا ، مامەکانی دایکی دایکی مردوو دایکی باوکی، پلك و پوورو خاڵی هەردوولا لە دایکرا یا تەنیا لەلایەکیانرا .

6ـ منالّەکانی ئەوانەی پلەی پێنج بە نێرو مێیەوە. کچی مامی باوکی باوکی مردوو لەدایکوباوکرا یا تەنیا لەدایکرا، کچەکانی کوڕەکانیان و بەرەو خوارەوە منالّەکانی ئەم کچانە و بەرەو خوارەوە ...هتد .

## (( میراتی پلەی یەکەم ))

پلەی یەکەم کە بریتیە لە مامەکانی دایکی و پلکەکانی لایەنی باوك و خالّەکان و پورەکانی لایەنی دایك. میراتی ئەم پلەیە بەگوێرەی ئەم حالّەتانەی خوارەوەیە:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر یەکێك لەوان بەتەنیابوو هەموو میراتەکە دەبات یاپاشماوەکەی ئەگەر یەك لەهاوسەرەکان لەگەڵیابوو. وەك:

نموونە(1):

| مامی لە دایك | یا پلك | یا پوور | یا خالٚ |
|---|---|---|---|
| هەموو | هەموو | هەموو | هەموو |

نموونە(2):

| ژن | مامی دایکی | بنچینە | مێرد | پوور | بنچینە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پ | (4) | $\frac{1}{2}$ | پ | (2) |
| 1 | + 3 | = | 1 | + 1 | = |

**حاڵەتی دووەم** : ئەگەر لەیەك پتر بوون و لایەنی خزمایەتیان وەکو یەك بوو لێرەدا کامەی خزمایەتی بەهێزترە ئەویان میرات دەگری و ئەوی تریان بارنج دەبێت . وەك:

| پلکی لە دایکو باوك | پلکی لە باوك | پوری لە دایکو باوك | مامی لە باوك |
|---|---|---|---|
| هەموو | هیچ(بارنجە) | هەموو | هیچ(بارنجە) |

**حاڵەتی سێیەم**: ئەگەر لەیەك پتر بوون و لایەن و بە هێزی خزمایەتیان یەکسان بوون وەك هەموویان دایکوباوکی بن یا هەموویان باوکی بن یا هەموویان دایکی بن، هەموویان میرات دەگرن بە پێی ڕێسای ( للذكر مثل حظ الأنثيين ).وەك:

کوڕی پلکی[121] لەدایکو باوك | کچی مامی لەدایکو باوك | پلکی لە دایك | مامی لە دایك




بەهەمان شێوە پور لەگەڵ خاڵدا، ئەگەر هەردووکیان لەدایکوباوکرا بوون یا هەردوکیان تەنیا لەدایکرا بوون یا هەردوکیان تەنیا لە باوکرا بوون ، ماڵەکە دەکرێتە سێ بەش دوو بۆ خاڵ و یەکێکیش بۆ پوور.

**حاڵەتی چوارەم**: ئەگەر لایەنی خزمایەتیان جودا بوو وەك مامی لەدایك و پوری لە باوك و خاڵو پوور ، ئەوانەی لەلایەنی باوکرا بن وەك مامی لەدایك یا پلك دووسێیەك دەبەن چونکە وەك لەجیاتی باوك بن وایە ، ئەوانەی لەلایەنی دایکرابن

121 ) مەبەست لە پلك لێرە خوشکی باوکە .

وەك خاڵۆ یا پوور سێیەك دەبەن، وەك لەحیاتی دایك بن وایە. ئەگەر ژمارەشیان لەیەك پتر بوو لەسەر ڕێسایەکانی حالەتی دووەم و سێیەم میرات دەگرن .وەك :

نموونە(1):

| ژن | پلکی لەدایکو باوک | پوری لە دایکو باوک | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{4}$ | ب(3) | | (4) |
| 1 + | 2 + | 1 | = |

نموونە(2):

| پلکی لە باوک | پلکی لە دایك | پوری لە دایکو باوک | پوری لە باوک | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| $\frac{2}{3}$ | بارنجە | $\frac{1}{3}$ | بارنجە | (3) |
| 2 + | هیچ + | 1 + | هیچ = | |

واتە هی لایەنی باوك دوو بەش دەبات هی لایەنی دایك یەکە بەش . هەردووکیان دەکاتە سێ .

## ( میراتی پلەی دووەم )

پلەی دووەم کە بریتینە لە منالّەکانی پلەی یەکەم ، ئەگەر میراتگری خاوەن بەش و عەصەبەو سێ جۆرەکانی خاوەن ڕەحمی پێشوو هەروەها پلەی یەکەم لەجۆری چوارەم نەبوون، ئەگەر هەریەکیان بەتەنیا (نێر بوو یامێ) هەموو میراتەکە دەبات یاپاشماوەکەی ئەگەر ژنی لەگەلاّ بوو یامێرد.وەك:

| ژن | کچی خال | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) |
| 1 | + 3 = | |

ئەگەر لەیەك پتربوون یازۆر بوون بەگوێرەی ئەم حالّەتانەی خوارەوە میرات دەگرن:

**حالّەتی یەکەم** : ئەگەر لە یەك پتر بوون هەندێکیان لە هەندێکیا نزیکتر بوون کامەیان نزیکترە لە مردوو ئەویان میرات دەگرێ، ئەوەی دوور تر بارنج دەبێت. وەك:

| کچی خالّ | کوڕی کچی مام |
|---|---|
| هەموو | بارنجە |

**حالّەتی دووەم:** ئەگەر لەپلەی خزمایەتی وەکو یەك بوون بەلاّم لایەنی پەیوەندییان جودا بوو، ئەوەی پەیوەندی بە هۆی عەصەبەیە رەگەزیە(خزمی پشتە) پێشی ئەوەی پەیوەندی بە هۆی خاوەن ڕەحمە دەخرێت.وەك:

| کچی مامی لەباوك | کچی پووری لەدایکو باوك |
|---|---|
| هەموو | هیچ(بارنجە) |

**حالەتی سێیەم:** ئەگەر لەیەك پتربوون ولەپلەی خزمایەتی و لەلایەنی پەیوەندیان وەکو یەك بوون بەڵام لەبەهێزی خزمایەتیان جودا بوون ، کامەیان بەهێزترە ئەویان میرات دەگرێ و ئەویتریان بارنج دەبێ. ئەگەر نا هەموویان هاوبەشن لەمیرات لەسەر ڕێسای (للذكر مثل حظ الأنثيين)وەك:

| نموونە (1): | کچی خاڵ لە (ب.د) | کوڕی خاڵ لە( ب) |
|---|---|---|
| | هەموو | هیچ(بارنجە) |

| نموونە(2): | کوڕی پوور لە(ب.د) | کچی پوورلە (ب.د) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| | 2 | 1 | (3) |

**حالەتی چوارەم:** ئەگەر لە لایەنی پەیوەندی خزمایەتیان جودا بوو، ئەوەی پەیوەندی بە ڕێی باوکەوەیە دوو بەش دەبات ، ئەوەی پەیوەندی بەڕێی دایکەوە هەیە یەك بەش دەبات .واتە هەریەکە بەشی ڕەگەزی خۆی دەبات . وەك:

| کوڕی پوورلە (ب.د) | کوری خاڵ لە(ب.د) | بنچینە |
|---|---|---|
| 2 | 1 | 3 |

بەمە کۆتایی بەم باسە دێنین چونکە پلەکانی تریش هەر لەسەر ئەم قیاسەیە و ڕاهینانی دادگاییشیان نیە یا زۆر کەمە . ـ مادەی (89) لە یاسای باری کەسایەتی

کە بەردەوامە لە کار پێ کردنا و هەموار کراوەتەوە دەقەکەی بەم جۆرەیە: میراتگرەکانی بە خزمایەتی و چۆنیەتی میراتگرتنیان:

- باوك و دایك و منالەکان و بەرەو خوار بۆ هەر نێرێك دوو ئەوەندەی مێیەکە .

2- باپیرو داپیرەکان و براکان و خوشکەکان منالانی براکان و خوشکەکان .

3- مامەکان و پلکەکان و خاڵەکانو پوورەکان و خاوەن ڕەحمەکان.

4- خوشکی لە باوك و دایك وەك برای لە باوك و دایکە بۆ حەجب .

ئەمەش ئەگەرچی هەندێکی ڕێکە لە گەڵ فیقهی جەعفەری . بەلام وەك لە بڕیاری دادگای تەمییز ژمارە(11) \ کەسایەتی \964 لە 28\3\1984م جەستی کردووە لەسەر ئەوەی کە دانەری یاسای عیراقی تەنیا مەبەستی لەم دەقەدا ئەوەیە کە میراتگرەکان بە خزمایەتی دیار بکات، مەبەستی ئەوە نەبووە کە میراتگرەکان دابەش بکاتە چەند چینێك هەتا چینی پێشتر هی پاشتر بارنج بکات .

# { بەشی چوارەم }

## ﴿ سەرکەوتن و ڕاست کردنەوەی مەسەلەکان ﴾

هەندێك لە بنچینەکان هەندێ جار زیاد دەکاو پێی دەووترێ (عەول) واتە سەرکەوتن . هەندێ جار کەم دەکات وپێی دەووترێ (رەد) واتە گەڕاندنەوە. هەندی جاریش هەندێ لەبەشەکان بەسەر ژمارەی میراتگرەکاندا قەبولی دابەشکردن ناکەن؛ بۆیە پێویستی بە گونجاندن هەیە کە پێی دەووترێ (تەصحیح) واتە ڕاست کردنەوە، وەك لەم باسانەی خوارەوە دەردەکەوێ .

## { باسی یەکەم }

### ﴿ سەرکەوتن(عول)﴾

(عەول) سەرکەوتن: بریتیە لە پتر بوونی کۆی سەهمەکانی میراتگرەکان لە بنچینەی مەسەلە کە بریتیە لە بچوکترین ژمارەی هاوبەشی ژێرەکانی کەرتەکان، بەهۆی ئەوە بەشەکانیان کەمتر دەبێ لەوەی ئەگەر زیادی نەکردبا .

بەڵام ئەم ڕووداوە تەنیا لەسێ بنچینە ڕوو دەدات کە ئەمانەن: ( 6 ، 12 ، 24)
.واتە لە چوار بنچینەکانی تردا ڕوو نادات کە (8،4،3،2)ـە . ئەویش بەم گوێرەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** بنچینە(6) چوار جار سەرکەوتنی لێ ڕوو دەدات بەم جۆرەی خوارەوە :

**جاری یەکەم :** سەرکەوتنی(6) بۆ (7): وەك:

| مێرد | (2)خوشکی لە دایکو باوك | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | (6) |
| 3 | + 4 = | سەرکەوت بۆ ( 7 ) |

لێرەدا کۆی بەشەکان(3)ی مێردەکە و (4)ی دوو خوشکەکە لە جیاتی (6) بێ بووە (7)، واتە سەرکەوت. کەوابوو میراتەکە لەجیاتی دابەشی (6) بکەین دابەشی (7)ی دەکەین، چونکە بنچینەی مەسەلەکە بووە (7). واتە کەمتر وەر دەگرن لەوەی ئەگەر بنچینەکە (6) مابا.

**جاری دووەم:** سەرکەوتنی(6) بۆ (8): وك :

| مێرد | (2)خوشك(ب.د) | دایك | بنچینە |
| --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 3 | + 4 | + 1 = | سەرکەوت بۆ (8) |

لێرەشدا میراتەکە لەجیاتی دابەشی شەش بکەین دابەشی هەشت دەکەین.(3)بۆ مێرد، (4) بۆ دوو خوشکەکە، (1) بۆدایك .

**جاری سێیەم:** سەرکەوتنی بۆ (9). وەك:

| میرد | (2)خوشکی له باوکو دایك | دایك | خوشکیك له دایك | بنچینه |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 3 + | 4 + | 1 + | 1 = | سەرکەوت بۆ(9) |

**جاری چوارەم:** سەرکەتنی (6) بو (10). وەك:

| میرد | (2)خوشکی له باوك | دایك | (2)خوشکی له دایك | بنچینه |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | (6) |
| 3 + | 4 + | 1 + | 2 = | سەرکەوت بۆ (10) |

**دووەم:** بنچینە(12)سێ جار سەرکەوتنی لێ ڕوو دەدات:

**جاری یەکەم:** سەرکەوتنی (12) بۆ (13): وەك:

| ژن | (4) خوشکی(ب.د) | دایك | بنچینه |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | (12) |
| 3 + | 8 + | 2 = | سەرکەوت بۆ (13) |

**جاری دووەم:** سەرکەوتنی (12) بۆ (15). وەك:

| ژن | (2)خوشکێ (ب) | دایك | برایەکی (د) | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (12) |
| 3 + | 8 + | 2 + | 2 = | سەرکەوت بۆ(15) |

**جاری سێیەم:** سەرکەوتنی(12) بۆ (17): وەك:

| ژن | (4)خوشکی(ب) | دایك | (2)برای (د) | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | (12) |
| 3 + | 8 + | 2 + | 4 = | سەرکەوت بۆ (7) |

**سێیەم:** سەرکەوتنی بنچینە (24):تەنیا یەکجار سەرکەوتنی هەیە بۆ (27):وەك:

| باوك | دایك | (2)کچ | ژن | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{8}$ | (24) |
| 4 + | 4 + | 16 + | 3 = | سەرکەوت بۆ(27) |

# { باسی دووەم }

## ﴿ ڕاست کردنەوەی مەسەلەکان ( تصحیح المسائل ) ﴾

وەك دەزانین دەبێ ژمارەی بەشەکانی (سەهمەکان) هەر چینێك(صنف) لە چینەکانا دابەش بکرێ بەسەر ژمارەی چینەکە بەبێ ئەوەی ئەنجامی کەرت دەرچێ، وەك بڵێین ئەگەر چینەکە (2) خوشك بوو بەشەکانیشیان (4) بوون ، ئەمە ڕێکە ، چونکە (4) بەسەر (2)دا دابەش دەکرێ بەبێ مایەوە .بەڵام ئەگەر ژمارەی خوشکەکان (3) بوو (4)یان بەسەردا دابەش ناکری بەبێ مایەوە یابەبێ ئەوەی ئەنجامەکەی کەرت بێ، ئەم دابەش نەبوونە پێی دەووترێ شکانەوە (إنكسار) ، ئەم جۆرە مەسەلانەی شکانەوەیان تیادایە پێویستیان بە گونجاندن کەپێی دەوترێ (تصحیح) واتە ڕاست کردنەوە هەیە بەشێوەیەکی وا بەسەریاندا دابەش بکرێ .

**کەواتە ڕاست کردنەوەی مەسەلەکان (تصحیح المسائل):** بریتیە لە زیاد کردنی ژمارەی بەشەکان (سەهمەکان) بۆ ژمارەیەکی وا دابەش بکرێت بەسەر ژمارەی چینەکاندا بەبێ کەرت .

جا شکانەوەکە یا بەرامبەر بەیەك چین دەبێ یادوو چین یاسێ یاچوار کە بەم جۆرانەی خوارەوە چارە سەری دەکرێ:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر شکانەوەکە بەرامبەر بەیەك چین بوو بەگوێرەی ئەم ڕێسایانەی خوارەوە چارەسەر دەکرێ:

1 . ئەگەر هاتوو لە نێوان ژمارەی بەشەکان و ژمارەی چینەکاندا ناهەمواری(تباين)[122] هەبوو ، وەك هەردووكیان ژمارەی خۆبەش (عدد أولي) واتە دابەشنەکراو بن تەنیا بەسەر خۆیدا دابەش دەکرێ، یا یەکێکان خۆبەش بێت و ئەویتریان نا ، چارەکەی ئەوەیە ژمارەی چینەکە لە بنچینەی مەسەلەکە یا لە سەرکەوتوەکەی (عول) بدرێ (ئەگەر سەرکەوتنی تیابوو) ، وەك :

نموونە(1):

| باوك | دايك | (5)کچ | بنچينه | بنچينه پاش ڕاستكردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{2}{3}$ | (6) | (30) = 5×6 |
| 1 + | 1 + | = 4 | | |
| 5 + | 5 + | 20 = | (30) | |

(30)= 20 کۆی بەشەکان پاش لە (5) دان کە بنچینەی نووە.

لێرەدا بەشی 5 کچەکان کە(4)ـە بەسەریاندا دابەش ناکرێت بۆیە لە(6)مان دا بنچینەکە بوە (30). هەروەها لە بەشەکانیشماندا کۆیان بوە (30) کە بنچینەکەی نووە .

واتە ماڵەکە دەکەینە (30) بەش (5)ی بۆ باوك و (5)یشی بۆ دایك و بیستیشی بۆ کچەکان هەر یەکەی چوار . لێرەدا بینیمان کە (4) بەشەکانی کچەکان بەسەر ژمارەیان(5)دا دابەش نەدەکرا ، پاش چاکردنەوەکە بووە (20) دابەش کرا بەبێ کەرت .

---

122 ) ناهەمواری(تباين) واتە ئەو ژمارانەی ئەبەسەر یەکدا ئەبەسەر ژمارەیەکی هاوبەشی تردا دابەش ئەکرێن .

نمونە(2): ژن باوك دایك (3)کچ بنچینە بنچینە پاش ڕاستکردنەوە

$\frac{1}{8}$ $\frac{1}{6}$ $\frac{1}{6}$ $\frac{2}{3}$ (24) (81) =3 × 27

3 + 4 + 4 + 16 = سەرکەوت بۆ (27).

9 + 12 + 12 + 48 = (81) بەشەکان و کۆیان پاش لە 3دان.

لێرەدا ژمارەی(3) کە ژمارەی چینی کچەکانە لە سەرکەوتنی(عەولی) بنچینەی مەسەلەکە درا بۆڕاستکردنەوە، بوو بە (81)، (9)ی بۆ ژنەکەو (12)ی بۆباوك و (12)شی بۆدایك و(48)یشی بۆ سێ کچەکان هەریەکەیان(16) .

**2ـ** ئەگەر ژمارەی چینەکە لەگەڵ ژمارەی بەشەکەی گونجاو بوون لە دابەشکردنیانا لە سەر ژمارەیەکی هاوبەشی[123]، ژمارە گونجاوەکە(وفق)ی[124] چینەکە لە بنچینەی مەسەلەکە یا لە سەرکەوتەکەی دەدرێ ئەگەر سەر کەوتنی تیا بوو. وەك ئەم نموونانەی کە دێ :

123 ) وەك 4لەگەڵ 2 هەردوکیان بەسەر 2دا دابەش دەکرێن ، کەوابوو هەردوکیان گونجاون بە نیوە . یا (6) و(9) هەردووکیان دابەش دەکرێنە سەر 3،کەوابوو هەردووکیان گونجاون بە سێیەك ...هتد.

124 ) (وفق) کە ناومان نا گونجاو بریتیە لە ئەنجامی دابەشکردنی ژمارە لەسەر ژمارەی هاوبەشی ،وە ك نمونەی پێشو ویفقی چوارکە بەسەر دوودا دابەش بکەین دووە و وفقی نۆ کە بەسەر سێدا دابەش بکەین سێیە.

نمونە(1): داپیر (4)برای لەدایك برای(ب.د) بنچینە بنچینەپاش ڕاستکردنەوە

$\frac{1}{6}$ $\frac{1}{3}$ پاشماوە (6) ← (12) =2×6

1 + 2 + 3 =

2 + 4 + 6 = (12) بەشەکان و کۆیان پاش لە(2)دان.

لێرەدا بەشی براکانی لەدایك بەسەریاندا دابەش ناگرێ بەڵام لە نێوان ژمارەکانیان و ژمارەی بەشەکانیاندا گونجاو(وفق) هەیە بەنیوە، واتە هەردووکیان دابەشی دوو دەگرێن ، بۆیە نیوەی ژمارەی برای لەدایك کە دووە لەژمارەی بنچینەکە درا بوو بە (12)، بەشەکانیشیان بەگویرەی بنچینەکە بووە (4) و بەسەریاندا دابەش دەکرێ.

نموونە(2): ژن دایك باوك (6)کچ بنچینە بنچینە پاش ڕاست کردنەوە

$\frac{1}{8}$ $\frac{1}{6}$ $\frac{1}{6}$ $\frac{2}{3}$ (24) (81) =3×27

3 + 4 + 4 16 = سەرکەوت بۆ (27)

9 + 12 + 12 48 = (81) بەشەکان وکۆیان پاش لە (3)دان.

لێرەدا بەشی کچەکان بەسەر ژمارەیاندا دابەش ناکری، بەڵام هەردوو ژمارە گونجاون لەسەر دابەشکردنیان بەسەر دوو ، لەبەر ئەوە نیوەی ژمارەی کچەکان کە(3)یە لە

سەرکەوتی مەسەلەکە درا بوو بە (81)، هەروها لە بەشەکانیش درا، بەشی کچەکان بووە (48)بۆ ئەوەی بەسەر ژمارەی کچەکاندا دابەش بکری .

**حالەتی دووەم:** ئەگەر شکانەوەکە لە دوو چینی میراتگرەکاندا بوو ، بەراوردی لەنێوان ژمارەی بەش و ژمارەی چین دەکرێ ، ئەگەر گونجاو بوون ، هەرچینە دەگەڕێندرێتەوە سەر ژمارە گونجاوەکەی(وفق) خۆی ، ئەگەر گونجاویش نەبوون هەر چینە وەکو خۆی دەمینێتەوە ، پاش ئەوە ژمارەی چینەکان بەرامبەر یەکتری دەکرێن ، لێرەدا چوار ئەگەری هەیە:

1ـ ئەگەر ژمارەی چینەکان یا گونجاوەکانیان وەکو یەك بوون ، یەکیکیان لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین یا لە سەرکەوتەکەی ئەگەر سەرکەوتنی تیا بوو بەم جۆرە بەشەکان پتر دەبن بەشێوەیەکی وا دابەش بکرێن بەسەر چینەکان.وەك:

نموونە (1) :

| دایك | (6)خوشکی لە(د) | (12)خوشکی لە(ب.د) | بنچینە | بنیچینە پاش ڕاستکردنوە |
|---|---|---|---|---|
| | (3) | (3) | | |
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{2}{3}$ | (6) | (21) = 3×7 |
| 1 + | 2 + | 4 = | سەرکەوت بۆ (7) | |
| 3 + | 6 + | 12 = | (21) | بەشەکان وکۆیان پاش لە(3) دان . |

لێرەدا ژمارەی دوو بەش بەسەر چینەکاندا دابەش ناکرێ بەشی خوشکی(د)و بەشی خوشکی(ب.د). ڕاست کردنەوەکەشی بەم جۆرە بوو:

ژمارەی خوشکی (د) لەگەڵ بەشەکانی خۆیان ژمارەی گونجاویان(3)یە؛چونکە هەردووکیان دابەشی دوو کران، هەروەها ژمارەی خوشکی(ب.د) لەگەڵ بەشەکانیانا ژمارەی گونجاویان(3)یە چونکە هەردووکیان دابەشی چوار کران ، کەوابوو هەردوو گونجاوەکانی هەردوو چینەکە وەکو یەکن، بۆیە یەکێکیان له بنچینەی مەسەلەکە درا کردیە (27)، بەشەکانیش هەر بەم جۆرە لەسێ دران . پاش ئەوە دەرکەوت چۆن بەشی خوشکی له(د) کە بووە(6) وبەشی خوشکی له (ب.د) کە بووە (12) بەسەریاندا دابەش دەکرێ .

نمونە(2):

| دایك | (5)برای له (د) | (5)برای له (ب) | بنچینه | بنچینه پاش ڕاستکردنەوه |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | پاشماوه | (6) | (30) = 5×6 |
| 1 + | 2 + | 3 = | | |
| 5 + | 10 + | 15 = | (30) | بەشەکان و کۆیان پاش له(5) دان |

لێرەدا بەشەکانی براکان بە هەردوو جۆرەوە دابەش ناکرێ بەسەر ژمارەکانیاندا، ژمارەی هەردوو چینیش خۆبەشن و گونجاویان نیە لەگەڵ بەشەکانیانا ، بەڵام لەبەر ئەوەی هەردوو ژمارە وەکویەکن ، یەکێکیان کە (5)ـە له بنچینەی مەسەلەکە درا بوو بە (30) بەشەکانیش هەر له پێنج دران، بەم جۆرە کە بەشەکانی برای(د) بوو بە (10) و هی (ب) بوو بە(15) بەسەر ژمارەکانیاندا دابەش دەکرێ و مەسەلەکە ڕاست کراوە .

2ـ ئەگەر ژمارەی چینەکان چوونە ناو یەکیان هەبوو، گەورەکەیان لە بنچینەی مەسەلە یا لە سەرکەوتەکەی دەدەین، ئەگەر سەرکەوتنی تیابوو .وەك:

| دایك | ~~(8)~~ (4) برای(د) | ~~(8)~~ (2) خوشکی (ب) | بنچینە | بنچینە پاش ڕاستکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{2}{3}$ | (6) | (28) = 4 × 7 |
| 1 + | 2 + | 4 = | سەرکەوت بۆ (7) | |
| 4 + | 8 + | 16 = (28) | بەشەکان وکۆیان پاش لە(4)دان. | |

لێرەدا گونجاوی ژمارەی برای لە(د) لەگەڵ بەشەکانیان (4)ـە و گونجاوی ژمارەی خوشکەکانی(ب) لەگەڵ بەشەکانیان(2)وە، لەبەر ئەوەی (2) لەناو چوارە، چوارەکەمان لەبنچینەی مەسەلەکەدا، هەروەها لەبەشەکانیشمان دا بۆ ڕاست کردنەوەی مەسەلەکە.

نمونە(2):

| مێرد | (5)برای (د) | (10)برای(ب.د) | بنچینە | بنچینە پاش ڕاستکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | پاشماوە | (6) | (60) = 10 × 6 |
| 3 + | 2 + | 1 = | | |
| 30 + | 20 + | 10 = (60) | بەشەکان پاش لە(10) دان. | |

لێرەدا چونکە ژمارەی برای لە (د) لەناو ژمارەی برای لە (ب.د) دایە، گەورەکەمان کە(10)یە لە بنچینەی مەسەلەکە کەدا وهەروەها لە بەشەکانیشمان دا.

3ـ ئەگەر ژمارەی چینەکان گونجاو بوون ، ژمارەی گونجاوی یەکێکیان لە تەواوی ئەوی تر دەدرێ، ئەوجا ئەنجامەکەی لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین یا لە سەرکەوتەکەی ئەگەر سەرکەوتی بوو .




| دایك | (12)برای (د) | (16) خوشکی(ب.د) | بنچینە | بنچینە پاش چاکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{2}{3}$ | (6) | (84) = 12 × 7 |
| 1 + | 2 + | 4 = | سەرکەوت بۆ (7) | |
| 12 + | 24 + | 36 = | (84) بەشەکان و کۆیان پاش لە(12)دان. | |

ژمارەی گونجاوی براکانی لە(د) لەگەڵ بەشەکانیانا(6)ـە، ژمارەی گونجاوی خوشکەکانی لە(ب.د) لەگەڵ بەشەکانیانا (4)ـە ، ژمارەی گونجاوی 6و4 لەگەڵ یەکتری 3و2 وە. لێرەدا یا 3 لەچوار دەدین یادوو لەشەش دەدەین کە ئەنجامی هەردووکیان(12)یە ، ئەوجا(12) لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین کە (7)ـە دەبێتە(84) بەشەکانیش هەر لە(12) دران، بەم جۆرە مەسەلەکە ڕاست کراوە .

8 = 4×2

| نموونە(2): (2)ژن | (8) برای(ب.د) | بنچینە | بنچینە پاش چاکردنەوە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | (4) | (32) = 4 × 8 |
| 1 + 3 = | | | |
| 8 + 24 = (32) بەشەکان و کۆیان پاش لە (8) دانیان. | | | |

ژمارەی گونجاوی (8)برای لە(ب.د) لەگەڵ(2) ژن چوارە(4)، لێرەدا (4)لە (2) دەدەین دەبێتە (8) ئەویش لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین کە (4)ـە دەبێتە (32)، هەروەها لە بەشکانیش دەدرێ .

4ـ ئەگەر هەردوو چینەکان ناهەموار بوون واتە بەهیچ جۆرێك نەدەگەیشتنە یەکو گونجاویان نەبوو ، لە یەکتریان دەدەین و ئەنجامی لێکدانەکەش لە بنچینەی مەسەلەکە دەدەین .وەك:

نموونە: 12 =4× 3

| (3)کچی کوڕ | (4) برای لە(ب.د) | بنچینە | بنچینە پاش چاکردنەوە |
|---|---|---|---|
| $\frac{2}{3}$ | پاشماوە | (3) | (36) = 3×12 |
| 2 + 1 = | | | |
| 24 + 12 = (36) بەشەکان و کۆیان پاش لە 12 دان . | | | |

لێرەدا ژمارەی کچەکان(3) لەگەڵ ژمارەی برایەکان(4) ناهەموارن ، بۆیە لەیەکتریمان دا بوو بە(12) ، ئەنجا (12)مان لە بنچینەی مەسەلەکە(3)دا ، هەروەها لە بەشەکانیش درا .

- تێبینی: بەم جۆرە حالەتەکانی تر ئەگەر شکانەوە لەسێ چین یاچوار یا زیاتر هەبوو بەگوێرەی هەمان ڕێسایەکانی حالەتی دووەما چارەسەر دەکرێ .

## { باسی سێیەم }

## ﴿ گەڕاندنەوە (الرّد) لە مەسەلەکاندا ﴾

گەڕاندنەوە (الرّد) پێچەوانەی( العول)سرکەوتنە ، چونکە هەروەك بینیمان کە سەرکەوتن پتر بوونی بەشەکانە لە ژمارەی بنچینەی مەسەلە کە کۆی بەشەکانی میراتەکەیە، وەك بنچینەی میرات 12 بێت وکۆی بەشەکانیش 15بێت، بۆیە ژمارەی بەشەکان بە بنچینە دادەنێین کە کەمی دێخیتە بەهای بەشەکان . بەڵام گەڕانەوە بریتیە لە کەمتر بوونی کۆی بەشەکانی خاوەن بەشان لە بنچینەی مەسەلەکەی میرات، وەك بنچینەی مەسەلەکە (6) بێت وکۆی بەشەکان چوار دەرچێت، واتە دوو بەش ماوە، کە ئەم دوو بەشە دەگرێندرێتەوە(واتە دابەش دەکرێتەوە) سەریان هەر کەسە بە ڕێژەی بەشی خۆی .

**حوکمی گەڕاندنەوە:** گەڕاندنەوەی بەشەکان بەسەر میرات گرەکانی خاوەن بەش دروستە لای زۆربەی زانایان وەك حەزرەتی عومەرو ئیمامی عەلی و عەبدولای کوڕی مەسعودو عەبدولای کوڕی عەباس‌ﷺم لەگەڵ زۆر لە تابیعیەکان و ڕێبازی حەنەفی و شافیعیەکان ، تەنیا هاوسەرەکان نەبێ بەسەریاندا ناگەڕێتەوە و بەڵکو

تەنیا بەشەکانی خۆیان دەبەن. ئەگەر جگە لە هاوسەرایەتی پەیوەندی خزمایەتی تری میراتگرتنیان نەبێ [125] .

بەلگەشیان ئەم فەرموودەیەی خوایە لەسورەی ئەحزابدا:( وَأُولُوا الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (75)) واتە خزمی کە پەیوەندی ڕحمیان لەنێواندا هەیە لەیەکتری لە پێشترن .

حەزرەتی زەیدی کوڕی سابیت و ئیمامی مالیك و شافیعی وتویانە زیادەکە ناگەڕێتەوە سەر خاوەن بەشەکان، بەڵکو دەچێتە خەزنەی دەولەت ، بەلام شافیعیەکان دەڵێن دەڵێن بە مەرجێ خەزنەی دەولەت ڕێك بێت .

بە پێچەوزانەی ئەوە ریوایەت کراوە لە حەزرەتی عوسمان کە بۆ سەر هاوسەرەکانیشی گەڕاندوتەوە ، چونکە ئەوانیش خاوەن بەشن وەکو ئەوانی تر. بەلام ئەم ڕیوایەتە والێکدراوەتەوە کە ئەو هاوسەرەی گەڕاندیەوە سەری جیا لە هاوسەرایەتی خزمایەتی هۆی میراتگرتنی تری هەبووبێ ، یا لە مالی دەولەتی داوەتی نەك لە میرات، بەلام ئەمە بۆچونێکی دوورەو بەلگەی لەسەر نیە[126] .

بۆیە لە ڕوانگەی دادوەریدا وا دیارە کە وا باشترە ئەوانیش گەڕاندنەوەیان بەسەردا ببێ .

**مەرجەکانی گەڕاندنەوە:** گەڕاندنەوەی بەشی زێدە بەسەر خاوەن بەشەکاندا چەند مەرجێکی هەیە:

125 ) المغني لابن قدامة 6\203.

126 ) المغني لابن قدامة 6\203. میرات و وصیقت د. محمد طةزني ص96.

1ـ مانەوەی میرات لەپاش دابەش کردنی بەشی خاوەن بەشەکان.

2ـ هەبوونی میراتگری خاوەن بەش .

3ـ نەبوونی میراتگری بە پشت(عصبە).چونکە خزمی پشت پاشماوەکە دەبات و هیچ نامینێتەوە بۆ گەڕاندنەوە.

## (( چۆنیەتی گەڕاندنەوە ))

گەڕاندنەوەی بەشەکانی زێدە بەگوێرەی هەبوونی هاوسەرەکان و نەبوونیان دەگۆڕێ

### یەکەم : ( گەڕاندنەوە لە میراتا بەبێ هەبوونی هاوسەرەکان )

ئەم حالەتانەی خوارەوەی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر تەنیا یەك میراتگر بوو ، هەموو میراتەکە دەبات بە بەش و بەپشت ( بالفرض والتعصیب). وەك: تەنیا کچێك. نیوەی میراتەکە بەبەش دەبات و نیوەکەی تریشی دەگەڕێتەوە سەری، واتە هەموو میراتەکە دەبات.

**حالەتی دووەم:** ئەگەر لەیەك پتر بوون بەڵام یەك چین بوون ، هەموو میراتەکە لەنێوانیاندا دابەش دەکرێ بەبەش و بە گەڕاندنەوە. وەك:

1ـ (5) کچ : $\frac{2}{3}$ بە بەش + پاشماوە بەگەڕاندنەوە، واتە گشتی میراتەکە دەبەن .

2ـ (6) برای دایکی : $\frac{1}{3}$ بەبەش+ پاشماوە بە گەڕاندنەوە، واتە گشتی میراتەکە دەبەن

3ـ داپیر (دایکی دایك) ، داپیر (دایکی باوك) : $\frac{1}{6}$ بەبەش + پاشماوە بەگەڕاندنەوە ، واتە گشت میراتەکە دەبەن .

**حالەتی سێیەم:** ئەگەر لەیەك چین پتر بوون زیادەکە بەسەر هەموویاندا دەگەڕێتەوە هەرکەسە بە ڕێژەی بەشی خۆی ، ئەگەر بەشەکەی نیوە بوو نیوەی پاشماوەکە دەبات ئەگەر سێیەك بوو سێیەکی پاشماوەکە دەبات ئەگەر شەشێك بوو شەشێککی پاشماوەکە دەبات . ئیتر بەم جۆرە . واتە میراتەکە بەسەر کۆی بەشەکاندا دابەش دەکەین نەك بەسەر بنچینەکەی ، یا بەواتەیەکی تر کۆی بەشەکان خۆیان دەبنە بنچینە. وەك:

نمونە(1):

| دایك | خوشكی(ب.د) | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{3}$ | $\frac{1}{2}$ | (6) |
| 2 + | 3 = | (5)بنچینەکە کە شەشە کەم بوەوە بۆ(5). |

بۆیە مەسەلەکە لە (6) دەگەڕێندرێتەوە بۆ (5) واتە لەجیاتی شەش پێنجەکە دەکەینە بنچینە ، (2) بۆدایك (3)ش بۆ خوشکەکە.

نمونە(2):

| دایك | کچی کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | (6) |
| 1 + | 3 = | (4) بنچینەکە کە شەش بوو کەم بوەوە بۆ چوار. |

بۆیە مەسەلەکە لە شەش دەگەڕێندرێتەوە بۆ(4)، بەشێك بۆ دایك و سیانیشی بۆ کچی کوڕ .

نمونە(3): خوشکی لە(ب.د) خوشکیلە(د) بنچینە

| | | |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 3 + | 1 = | (4) |

بنچینەکە کە شەش بوو کەم بووەوە بۆ چوار. بۆیە مەسەلەکە لە(6) دەگەڕێندرێتەوە بۆ(4)، (3) بۆ خوشکی(ب.د)، (1) بۆ خوشکی(د) .

## دووەم : ( گەڕاندنەوە لە میراتا لە گەڵ هەبوونی هاوسەرەکان )

ئەم حالەتانەی خوارەوەی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر تەنیا یەك میراتگر لەگەڵ هاوسەرا هەبوو، هاوسەرەکە بەشی خۆی دەدرێتێ، پاشماوەکەش دەدرێتە میراتگرەکەی تر بەبەش و بە گەڕاندنەوە. وەك :

نمونە(1): ژن خوشکی لە (ب.د)

| ژن | خوشکی لە (ب.د) |
|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە بەبەش و بەگەڕاندنەوە |
| 1 + | 3 = 4 |

لێرە بەشێك بۆ ژنەکەو پاشماوەکەش کە 3 بەشە بۆ خوشکی (د..ب) ئەگەر وانەبا خوشکەکە تەنیا نیوەی دەبرد .

نمونە(2): مێرد دایك

| مێرد | دایك |
|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | پاشماوە بە بەش و بەگەڕاندنەوە |

واتە نیوە بۆ مێردەکەو نیوەکەی تریش بۆ دایکەکە بە بەش و بە گەڕاندنەوە.

حالەتی دووەم: ئەگەر ئەوانەی گەڕانەوەیان بەسەردا دەگرێ لەیەك زیاتر بوون بەڵام یەك چین بوون ، ئەگەر پاشماوەكەی بەسەردا دابەش دەكرا ئەمە كێشەی نیە، بەڵام ئەگەر بەسەریاندا دابەش نەدەكرا هەمان ڕێسایەكانی ڕاستكردنەوەی مەسەلەیان لەگەڵا بەكار دێت . بەم جۆرەی خوارەوە:

1ـ ئەگەر پاشماوەكە دابەش كرا بەسەر ئەوانەی گەڕاندنەوەیان بەسەردا دەكرێت بەم جۆرەیە . وەك:

| مێرد | كچ (3) | بنچینە |
| --- | --- | --- |
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە بە بەش و بە گەڕاندنەوە | (4) |
| 1 + | 3 = | → (4) |

2ـ ئەگەر پاشماوەكە دابەش نەدەكرا بەسەر ژمارەی چینەكە، ئەگەر گونجاویان(وفق) لەنێواندا هەبوو گونجاوی ژمارەكەیان لە ژێری بەشی ئەوەی گەڕاندنەوەی بۆ سەر نیە دەدین لەگەل بنچینەكە .

نموونە:

| مێرد | كچ ~~(6)~~ → (2) گونجاو | بنچینە بنچینەی نوو |
| --- | --- | --- |
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە بەبەش و بەگەڕانەوە | (8) =2 × (4) |
| 1 + | 3 = | |

2 ×1 = 2 + 2×3 = 6 = (8) بەشەكان پاش ڕاست كردنەوە .

لێرەدا لەنێوان ژمارەی کچەکان(6) وبەشەکانیانا کونجاو(وفق) هەیە بە سێیەك ، سێیەکی شەشەکە کە (2)وە لە (4) دەدرێ دەبێتە (8) بنچینەی نوو، لە(3)ش دەدرێ دەبێتە (6)بۆ کچەکان ، لە (1)یش دەدرێ دەبێتە (2) بۆ مێردەکە.

3ـ ئەگەر پاشماوەکە دابەش نەدەکرا بەسەر ژمارەی چینەکەو ناهەمواری لە نێوانیاندا هەبوو، واتە گونجاویان لەنێواندا نەبوو ، تەواوی ژمارەکە لە لە ژێری بەشی ئەوەی گەڕانەوەی بەسەردا نیە دەدرێ . وەك :

| ژن | 5کچ | بنچینە | بنچینەی نوو |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | پاشماوە | (8) | 5 × 8 = (40) |
| 1 | + 7 = | | |
| 5 | + 35 = (40) | بەشەکان وکۆیان پاش ڕاست کردنەوە . | |

لێرەدا بەشی کچەکان(7)ـە بەسەر ژمارەکەیاندا(5)دابەش نەدەکرا، ناهەمواریان لەنێواندا هەبوو، تەواوی بەشی کچەکان کە(5)ـە لە (8) دراو لەبەشەکانیش درا، پاش ڕاست کردنەوە کەبەشی کچەکان بوە(35) دابەش کرا .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەگەر ئەوانەی گەڕانەوەیان بەسەردا دەکرێ لە چینێك پتر بوون بەگوێرەی ئەم ڕێسایانەی خوارەوە چارەسەر دەکرێ :

1ـ مەسەلەیەك دادەنرێ بنچینەی پێك هاتبێ لە ژێری بەشی(هاوسەرەکان) واتە ئەوانەی بەسەریاندا ناگەڕێتەوە .

| ژن | دایك | کچی کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | پاشماوە | | (8) |
| 1 | + 7 | = | |

لێرەدا ژنەكە كە بەسەریدا ناگەڕێتەوە بەشەكەی خۆی كە یەكە (1) وەری دەگرێ.

2ـ دوای دیار كردنی بەشی ئەوانەی بەسەریاندا ناگەڕێتەوە پاشماوەكەی میراتێكی سەربەخۆیەو ، مەسەلەیەكی نووی بۆ دادەنێین تایبەت بەوانەی بەسەریاندا دەگەڕێتەوە بنچینەكەی پێك دێ لە ژمارەی هاوبەشی ژێری بەشەكانیان .

| دایك | کچی کوڕ | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | (6) دەیگرێنینەوە بۆ (4). |
| 1 | + 3 | = (4) كە دەكرێتە بنچینەی ئەم مەسەلەیە . |

واتە لێرەدا بەشیك بۆ دایكە و چواریش بۆ كچەكەیە .

3ـ هەردوو مەسەلەكان دەكرێنە یەك مەسەلە بەلێكدانی بنچینەی هی دووەم پاش گەڕاندنەوەی لە بنچینەی هی یەكەم ، ئەنجامی كۆی هەردوو مەسەلەكان دەبێتە بنەمای دابەش كردنی میرات بەسەر هەمواندا .

$8 \times 4 =$ (32) بنچینەی مەسەلەی كۆكراوە.

4. ئەوەی بەسەریادا ناگەڕێتەوە بەشی خۆی وەردەگرێ لە لێدانی بەشەکەی پێشووی لە بنچینەی مەسەلەی دووەم پاش گڕاندنەوە.

1 × 4 = 4 بەشی ژنەکە بەبێ گەڕاندنەوە سەر.

5 ـ ئەوانی تر کە گەڕاندنەوەیان بەسەردا هەیە بەشی خۆی لە مەسەلەی دووەم وەردەگرێ پاش لێدانی لە پاشماوەی ئەوانەی بەسەریاندا ناگەڕێتەوە لە مەسەلەی یەکەمدا .

1×7= 7 بەشی دایك پاش گەڕاندنەوە .

3×7=21 بەشی کچەکە پاش گڕاندنەوە.

ئەمە چونکە پاش لێدانی (4) لە (8)، واتە لە (7)یش درا بووە(28) پاشماوەی دایك و کچ پێش گەڕاندنەوە، کە بەرامبەری بەشەکەی دایك و سێ بەشەکەی کچە ، واتە بەرامبەر چوارە ، ئەویش بریتیە لە ئەنجامی لێکدانی چوار لەحەوت، بۆیە بەشی دایك و کچمان لە (7) دا بەم جۆرەی خوارەوە :

| ژن | دایك | کچی کوڕ | بنچینە | |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | (8) | (8)×4 بنچینەی مەسەلەی دووەم = (32) |
| 1 | (7)پ | | | |
| 4 | 28 کە بریتیە لە بەشی دایك و(3)کچەکە . | | | |

نمونە(2):

| ژن | کچ | کچی کوڕ | دایك | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | پاشماوە | پاشماوە | پاشماوە | (8) |
| 1 | + | 7 | = | |

لەبەر ئەوەی ژن بەسەریدا ناگەڕێتەوە مەسەلەیێکی تر دادەنێین لە وانی تر:

| کچ | کچی کوڕ | دایك | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |

3 + 1 + 1 = 5 ئەم پێنجە کە کۆی بەشەکانە دەبێتە بنچینەی ئەم مەسەلەیە .

بنچینەی مەسەلەی یەکەم (8) ×(5) بنچینەی مەسەلەی دووەم = (40) بنچینەی کۆی هەردوو مەسەلەکان.

5 × 1 = 5 بەشی ژنەکە بەبێ گەڕاندنەوە سەری.

7 × 3 = 21 بەشی کچەکە پاش گەڕاندنەوە سەری.

7 × 1 = 7 بەشی کچی کوڕ پاش گەڕاندنەوە سەری .

7 × 1 = 7 بەشی دایك پاش گەڕاندنەوە سەری .

نموونە(3):

| ژن | خوشکی(ب.د) | خوشکی(د) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | پاشماوە | | (4) |
| 1 | + | 3 = | |

لەبەر ئەوەی ژن بەسەریدا ناگەڕێتەوە، مەسەلەییێکی تر لە وانی تر دادەنێین :

| خوشکی لە (ب.د) | خوشکیلە (د) | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |
| 3 | + 1 = | (4) ئەم چوارەکە کۆی ئەم بەشانەیە |

دەبێتە بنچینەی ئەم مەسەلەیە... بنچینەی مەسەلەی یەکەم (4) × (4) بنچینەی مەسەلەی دووەم = 16 بنچینەی کۆی هەردوو مەسەلەکان .

4 × 1 = 4 بەشی ژنەکە پێش گەڕاندنەوە.

3 × 3 = 9 بەشی خوشکی لە (ب.د) پاش گەڕانەوە سەری .

3 × 1 = 3 بەشی خوشکی لە (د) پاش گەڕشانەوە سەری .

نمونە(4):

| ژن(2) | کچ(6) | داپیر(2) | بنچینە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | پاشماوە | | (8) |
| 1 | + 7 = | | |

لەبەر ئەوەی ژنەکان بەسەریاندا ناگەڕێتەوە مەسەلەییێکی تر لەوانی تر دادەنێینەوە .

| کچ(6) | داپیر(2) | بنچینە |
|---|---|---|
| $\frac{2}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | (6) |

4 + 1 = کـۆی ئـەم بەشـانە کـە(5)ـە دەکرێتـە بنچـینەی ئـەم مەسەلەیە ، بۆ ئەوەی زیادەکە بەسەریاندا بگەڕێتەوە .

بنچینەی مەسەلەی دووەم(5)× (8)بنچـینەی مەسـەلەی یەکـەم = 40 بنچـینە کـۆی هەردوو مەسەلەکان پێشی گەڕانەوەو پاشی گەڕانەوە .

5 × 1= 5 بەشی ژنەکان بەبێ گەرشاندنەوە سەریان .

7 × 4 = 28 بەشی کچەکان پاش گەڕاندنەوەسەر .

7 × 1 = 7 بەشی داپیرەکان پاش گەڕاندنـەوە سەر .

بەڵام بەشـەکانی هەرسـێ چـینەکان بەسـەریاندا دابـەش نـاکرێ ، بۆیـە پێویسـتی بـە ڕاستکردنەوە هەیە:

ژمـارەی کچـەکان(6) لەگـەڵ ژمـارەی ئـەوانی تـر گونجـاوی هەیـە بـەنیوە ، کـەوابوو گونجاوی (6) سێیە .(3) لەژمارەی داپیرەکان دەدەین دەبێتە شـەش ، ئـەم شەشـە لـە بنچینەی مەسەلەکە دەدین ...

6 × 40 = 240 .

6 × 28 = 168 بەشی کچەکان .

6 × 7 = 42 بەشی داپیرەکان .

6 × 5 =30 بەشی ژنەکە .

# { بەشی پێنجەم }

## ﴿ میراتی بە خەملاندن ﴾

هەندێ لە میراتگران دیار نیە ئاخۆ میرات دەگرن یان نا ، لەبەر ئەگەری بوون و نەبوون، وەکو کۆرپەڵە واتە مناڵ لە کاتی کە لەسکی دایکی دایە. یا لەبەر بزربوون وەکو دیل و ون بووی بێ سەروشوون ، یا لەبەر تێکەڵی و نەدیاری ڕەگەز وەکو نێراموك، بۆیە هەریەك لەمانە باسێکی بۆ تەرخان کراوە بۆ دیار کردنی میراتەکەی.

# { باسی یەکەم }

## ﴿ میراتی کۆرپەلە ﴾

مەبەست لە کۆرپەلە منالّی ناو سکی دایکە ، منالّی ناو ڕەحمی دایك ، هەر لە سەرەتای دروست بونیا شایەنیەتی پێویستی ناتەواوی (أهليه الوجوب الناقصه)ی بۆ پەیدا دەبێ ، میرات لە میرات لێگیراوەکەی دەگرێت بەم مەرجانەی خوارەوە:

1. دەبی لە هاوسەرگیری شەرعی حەلال پەیدا بوبێ، چونکە منالّی زینا میرات ناگرێ.

2. لەکاتی مردنی میرات لێگیراو دەبێ وەسك کەوتبێ ، واتە لەناو ڕەحمدا پەیدا بووبێ پێشی مردنی میرات لێگیراو .

3ـ دەبێ بە زیندویی لە دایك ببێ ، ئەگەرچی پاش بوونی بە چرکەیەك بمرێ، بەڵام دەبێ نیشانەی ژیانی لێ دەرکەوێ وەکو گریان یان پیرکژین یا جوولە یا هەر نیشانەیێکی بە دڵنیایی بەڵگەی زیندوییە .

چونکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی: ( إذا استهَلَّ المَوْلُودُ وُرِّثَ)[127] واتە ئەگەر منالی تازە لەدایك بوو هاواری کرد میرات دەگرێ ، لە ڕیوایتیکی ترا دەفەرموێ: ( لا يَرِثُ الصَبِيُّ حتى يَستهِلَّ صَارِخًا قال: وَاستِهلالُهُ أنْ يَبْكِيَ وَيَصِيحَ أو يَعطِسَ)[128] واتە منالٚ میرات ناگرێ هەتا هاوار نەکات ، هاوارەکەی وەك بگریێ یا بقیژێنێ یا بپیرکژێ ...

**ماوەی لەسکدابوون :**

کەمترین ماوەی لەسکدابوون شەش مانگە و ئاساییکەی نزیکەی نۆ مانگە[129]، چونکە منالی لەدایك بوو لە شەش مانگ زووتر تەواو نیە و ناژیێ ...زیاتریش لە نۆ مانگ قسەی زۆری لەسەر کراوە ، لای حەنەفیەکان لەوانەیە هەتا دوو ساڵ گیر بێت واتە لەسکی دایکیدا بمێنێتەوە چونکە لە دایکی ئیمانداران عائیشە ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی: ( لا تزِيدُ المَرأةُ في حَمْلِهَا على سَنَتَينِ قدرَ ظِلِّ المِغْزَلِ)[130] واتە ژن لە ئاوسیەکەیدا[131] لە دووساڵ بەقەدەر سێبەری تەشی زیاد ناکات .

---

127 ) سنن ابي داود 3|128 الحديث رقم 2920 .

128 ) سنن إبن ماجة 2|919 الحديث رقم 2751 .

129 ) فقه المواريث للأساذ نظام الدين عبد الحميد ص206 . احكام الميراث والوصية للدكتر مصطفى إبراهيم الزلي ص126 .

130 ) سنن البيهقي الكبرى 7|443 الحديث رقم 15330.

لای شافیعیەکان و قسەی دیاری مالیکیەکان و ڕیواتێکی ئیمامی ئەحمەد لەوانەیە چوار ساڵ بمێنێتەوە ،لای هەندێ زانای تر یەك ساڵ ، بەڵگەشیان داتاکردن و لێپێچانەوەی خەڵکانە کە لە ئەنجامدا هەرکەسە ماوەیێکی بۆ چەسپاوە .

بەڵام لای زاهیریەکان لەگوین[132] نیە منالٚ زیاتر لە نۆ مانگ لە سکی دایکیدا بمێنێتەوە ، ئیبن و حەزمی ئەندەلوسی ڕیوایەتەکانی بۆچوونەکانی تری بە لاواز داناوەو کاری پێ نەکردووە ...بەڵام زانست و توێژینەوەی پزیشکی وا ڕادەگەیێنێ کە منالٚ لە ساڵێك زیاتر لەناو سکی ژندا نامێنێتەوەو ناژیێ ...

ئیتر لە وانەیە بە دەگمەنی هەندێ ژن لەبەر کاری جەستەیی و بایۆلۆجی تایبەت وا ڕێك کەوێت منالّیان لە ماوەی خۆی درەنگتر پی بگاو ببێ؛ هەروەك وا ڕووی داوە کە یەکێك منالّی دووسەری ببێ یەکێکی تر پێنج منالّی بە زگێك ببێ...هتد . بەڵام لەکاتی خۆیا وەکو ئەم سەردەمە نەبوە و نەیانتوانیوە نەهێلّن گیر بێ و نەشتەگەری بۆ بکەن هەتا نەمرێ یا کێشەی تەندروستی لێ پەیدا نەبێ ، لەوانەیە چەند

131 ) زاراوەی کوردەواری خۆمان ژن کە منالّی لەسکدایە پێی دەلّێن (ئاوس) بەلام ئەم وشەیە بەزۆری بۆ ئاژەلٚ بەکار دێ لەبەر شەرم بە مەجاز بە ژنی ئاوس وتراوە سکی هەیە . بۆیە ژنەکان لەناو خۆیانا دەلّێن فلانە ژن ئاوسە سکی لەسەر سینگە، واتە سکی زۆر گەورەیە ، ئەمەش وا ناگیێنێ کە ئەم وشەیە بەکار نێت ، چونکە زاراوەیەو شەرم نیە. کەوابوو پێویستە ئاوسی بە کوردی بەرامبەر بە (حمل)ی عەرەبی بەکار بێت...

132 ) گوین واتە مومکین. زاراوەیێکە دایکم خوا لێی خۆش بێت بەم واتەیە بەکاری دەهێنا ، هەموجار لە قسەکانیدا لەباتی بلّێ مومکینە دەیوت لەگوینە ، وادیارە لەپێشینیان وەری گرتوە ، بۆیە بە باشم زانی بەکاری بێنم ، هەتا ون نەبێ . بەلام لێرەدا پیتی (گ) بە (ج) بەکار دەهێنا چونکە لە زاراوەی خۆشناوەتیدا هەر (گ) یێك پیتی (ی)یی بەدوادابێت بە (ج) قەلەوی وەکو عەرەبی وتەی(لفف) پێ دەکرێت . واتە جێگەی دەنگەکەی لە سەرەتای بانی دەم پشت ددانەکانی پێشەوەی سەرەوەیە .

ڕوداوی دەگمەن بەم شێوەیە ڕوویدابێ و بیسرابێ ، بۆیە زانایان ئەم قسانەیان كردووە .

ئەم كێشە و بۆچونانەش هەر بۆ ئەوەیە تا بزانرێ ئایا ئەگەر منداڵێك پاشی مردنی باوكی بە ساڵێك یا سێ ساڵ یا چوار ساڵ لە دایك بوو بە منداڵی باوكی دەژمێردرێ و میرات دەگرێ یان نا ، هەركەسە لەسەر بۆچوونی خۆی ئەگەر لەو ماوەی داینا وە كە منداڵ گیر دەبێ لە و ماوەیەدا ببێ ئەوا منداڵی باوكیەتی و هی زینا نیەو میراتی لێ دەگرێ ، ئەگەر نا میرات ناگرێ ..

بەڵام ئێستا لەو سەردەمەدا كە زانستی پزیشكی و ئامێرەكانی زۆر پێش كەوتووە دەتوانرێ ئەم كارە بزانرێ و چارەی بكرێ. لە لایەكی ترەوە حیكمەت و دوور بینی وادەخوازی لەكاتی گومانا بۆچوونی ئەم زانایانە كاری پێ بكرێ بۆ تێكنەچوونی خێزان و بڕینی ڕێی فیتنە .

## دابەش كردنی میرات لەكاتی هەبوونی كۆرپەلە :

ئاوسی ژن لەوانەیە بە منداڵی نێر بێت یا مێ ، لە وانەیە بەیەك منداڵ بێت یا دوو یا زیاتر، لەوانەشە منداڵەكە بە مردی لە دایك بێ یا بە زیندوویی لەوانەیە زوو لەدایك بێت یا درەنگ... لەبەر ئەم ئەگەرانە زانایان چەند جۆرە بۆچوونیان هەیە بۆ دابەشكردنی میرات لەكاتی هەبوونی كۆرپەلە :

1ـ دابەشكردنی میراتەكە دوا دەخسترێ ئەگەر منداڵ بوونەكە نزیك بوو بە مەرجێ كاریگەری لەسەر باری ژیانی میراتگرەكان نەكات، بەڵام ئەگەر منداڵ بوونەكە دوور بوو بە ڕێدانی میراتگرەكان دوا دەخسترێ، دەنا دوا ناخسترێ .

2ـ ئەگەر منداڵەكەی ناو سك لەكاتێكا كە بوو میراتگرەكانی تر گشتیان بارنج (حجب) دەكات ، دەبێ دابەشكردنەكە دوا بخسترێ. وەك یەكێك بمرێ تەنیا ژنەكەو

براو خوشكی لە پاش بەجێ بمێنێ، ژنەكەشی ئاوس بێ بە منالێك ، ئەگەر كوڕ بوو جگە لە ژنەكە گشتیان بارنج دەكات و هیچ وەرناگرن ، ئەگەر كچیش بوو نیوەی میراتەكە بۆ ئەوەو هەشتێكیش بۆ ژنەكەیە ، پاشماوەكەی تر بۆ براو خوشكەكانیەتی .

3ـ ئەو میراتگرانەی بەشیان ناگۆڕی بە منالْ بوونەكە میراتی خۆیان وەردەگرن وەك لەو نموونەی پێشوو ، ژنەكە هەشتێكی خۆی وەردەگرێ و پاشماوەكەی هەڵدەگیرێ هەتا منالّەكە دەبێ ، ئەگەر كوڕ بوو ئەوانی تر هیچ وەرناگرن ، ئەگەر كچ بوو نیوەی دەبات ، جا پاشماوەكەی تر بۆ براو خوشكەكانە.

4 ـ ئەگەر میراتگرەكان بەشیان بە لەدایكبوونی منالّەكە ناگۆڕێ، هەركەسە بەشی خۆی پێ دەدرێ و بەشی منالّەكەش هەڵدەگیرێ هەتا دەبێ ، بە مەرجێ متمانە لەوانی تر وەربگیری ئەگەر ئاوسیەكە لە منالێك زیاتر بوو دەبێ زیادەكەی بۆیان چووە بیگێڕنەوە ... وەك یەكێك بمرێ سێ منالی لەپاش بەجێ بمێنێ و ژنەكەشی ئاوس بێ ، ئەگەر یەك بو ئەوە بەشەكە بۆی دانراوە وەری دەگرێ ، ئەگەر دوو بوون بەشی ئەوانی تر كەم دەكاتەوەو دەبێ بیگێڕنەوە هەتا بەشی دووەمی لێ پێك بینن .

5 ـ ئەگەر منالّەكەی ناو سك بەبارێكەوە میراتگر بوو وبەبارێكی ترەوە میراتگر نەبوو ، بە میراتگر دادەنرێ و بەشەكەی بۆ هەڵدەگیری ، ئەگەر میراتگر دەرچوو پێی دەدرێ ئەگەر نا دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەكانی تر هەر كەسە بە ڕێژەی بەشی خۆی ... وەك یەكێك بمرێ و دوو كچ و بوكێكی ئاوسی لەپاش بەجێ بمێنێ ، دوو كچەكان دووبەشی خۆیان وەردەگرن و سێیەكەكەی تر بۆ منالّەكەی ناو سك دادەنرێ ، ئەگەر نێر بوو بە عەصەبە دادەنرێ و سێیەكەكەی دەدرێتێ ، ئەگەر مێش بوو بەدوو كچەكە بارنج (حەجب) دەبێ و هیچ وەرناگرێ و سێیەكەكە بۆیان

دەگەڕێندرێتەوە .

6ـ ئەگەر بەشی منالّی ناو سك بە پێی نێرو مێیی بگۆڕێ ، کام لای بۆ باشترە بەشی ئەوی بۆ هەلّدەگیرێ. واتە ئەگەر بەشی لایەنی نێری پتر بوو ئەوی بۆ دادەنێین ، وەك یەکێك بمرێ دایکی و دوو کوڕی و ژنی ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ ، لێرەدا دایك و ژنەکەی بە بوونی منالّەکە بەشیان ناگۆڕێ ، کچ بێ یا کوڕ ، چونکە لە هەردوو حالەتدا دایك شەشێك وەردەگرێو ژنەکەشی هەشتێك ، بۆیە بەشی کوڕ بۆ منالەکە هەلّدەگیرێ ، ئەگەر نێر بوو ئەوا بەشەکەی خۆی وەردەگرێ ، بەلاّم ئەگەر مێ بوو نیوەی بەشەکە وەردەگرێ و نیوەکەی تر دەگەڕێندرێتەوە سەر دوو کوڕەکان.

بەلاّم ئەگەر لایەنی بەشی مێ بۆ باشتر بوو ئەوی بۆ دادەنێین وەك: یەکێك بمرێ ژن و باوك و دایك و کچێك وبووکێکی ئاوسی لە پاش بەجێ بمێنێ ... لێرەدا بەشی کچ بۆ منالّەکەی ناو سك دادەنرێ چونکە بەشەکەی پتر دەردەچێ ، بەلاّم ئەگەر بەکوڕی دابنێین بەشەکەی کەمتر دەردەچێ . وەك ئەم نموونەیە :

| ژن | باوك | دايك | (1)كچ | كۆرپەی ناوسك ئەگەر(كور)بێ | بنچينە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | پاشماوە | (24) |
| 3 + | 4 + | 4 + | 12 + | 1 = | |

| ژن | باوك | دايك | (1)كچ | كۆرپەی ناوسك ئەگەر(كچ)بێ | بنچينە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{8}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | (24) |
| 3 + | 4 + | 4 + | 12 + | 4 = | سەرکەوت بۆ (27) . |

لێرەدا دەرکەوت کە بەشی کچ بۆ کۆرپەکە دابنین باشترە چونکە پترە ، بۆ ئەوەی ئەگەر کچ بوو بەشی خۆی وەردەگرێ ئەگەر کوریشی بوو دەتوانین هەر یەکە بەشی خۆی پێ بدەین و ئەوی تر بگەڕێندرێتەوە سەر میراتگرەکانی تر .

## { باسی دووەم }

## ﴿ میراتی ون بوو و دیل ﴾

**ون بوو:** ئەو کەسەیە کە بێ سەروشوون چوەو ژین و مردنی دیار نیە[133]. وەك یەکێك بۆ بازرگانی یا گەشتیاری یا هەر کارێك بچێتە دەرەوە و نەگەڕێتەوە ماڵێ و هیچ دەنگ و باسی نەبێ و جێگەی دیار نەبێ لەکوێیە. یا سەرباز بێ‌و چوبێتە جەنگ و نەگەڕابێتەوەو دیاریش نەبێ ئایا بە دیل گیراوە یا کوژراوە یا هەڵاتوە ، ماوە یا نەماوە .

بە پێی ڕێسای (الیقین لا یزول بالشك) واتە دڵنیایی بە گومان لاناچێ ، هەروەها ڕێسای (الأصل بقاء ماكان على ماكان) واتە ڕەسەن وایە هەر کارێ چۆنە وەکو خۆی بمێنێتەوە ، ڕێسای (الأصل في الصفات العارضة العدم) واتە ڕەسەن لە خووە ڕوداوەکان نەبوونە ، بەگوێرەی ئەم ڕێسایانە ئەگەر یەکێك ون بوو بە زیندو دەژمێردرێ و دەست لە ماڵی نادرێ ، واتە میراتی دابەش ناکرێ بەڵام میرات لە میرات لێگیراوی خۆی دەگرێ ، هەتا بەڵگەی مردنی دەردەکەوێ ، ئەوجا بڕیاڕی تری لێ دەدرێ ... بۆیە لای حەنەفیەکان ڕێسایەکیان هەیە دەڵێ: ( إن المفقود يجعل حيا في ماله ميتا في مال غيره) واتە مردوو بۆ ماڵی خۆی بە زیندوو دادەنرێ و بۆ ماڵی

---

133 ) شرح فتح القدير6|141 .

خەڵکی تر به مردوو ، واته خزمی میراتی لێ ناگرێ هەتا دەرنەکەوێ کە مردووە، بەڵام ئەگەر خزمی مرد میراتەکەی پێنادرێ بەڵکو بۆی هەڵدەگیرێ هەتا لایەنی ڕاستی دەردەکەوێ، ئەگەر دەرکەوت زیندووە پێی دەدرێ و ئەگەرنا دەگەڕێندرێتەوە سەر مراتگرەکانی تر[134] ...

چونکە ون بوون دوو حالەتی هەیە بە پێی حاڵەتەکان بڕیاری پێ دەدرێ:

**حالەتی یەکەم:** ئەوەیە لە بارودۆخێکی وا بمرێ لایەنی زۆری وابێ کە مردبێ، وەك ون بوون لە ئەنجامی جەنگدا یا بەهۆی نقوم بوونی کەشتیەکەی لەناو دەریاو یا بزر بوونی لە بیابان وهەر جێگەیێکی مەترسی فەوتانی تێدا بێ بە هۆی دڕندەو دوژمن و ڕێگرو شتی تر ... ئەم جۆرە کەسە لای کۆی سەحابەکان و زۆربەی زانایان وەك مالیك وشافعی و ئەحمەد دوای چوار ساڵ بڕیاری مردنی لە دادگا پێ دەدرێ ، بۆ شووکردنەوەی ژنەکەی و لەسەر ئەمەش میراتەکەشی دابەش دەکرێ[135]...

**حالەتی دووەم:** ئەگەر ون بوونەکەی بەلایەنی زۆری وا نەبێ کە مردبێ وەك بەسەفەر چووبێ بۆ بازرگانی یا خوێندن یا گەشتیاری ، جا نەگەڕابێتەوەو هیچ باس وخواسیشی نەبێ چی لێهاتووە ، ئەم جۆرە کەسە لای ئەبوحەنیفەو مالیك و شافیعی و ئیمامی ئەحمەدەوە میراتەکەی دابەش ناکرێ و ژنەکەشی شوو ناکاتەوە هەتا بە دڵنیای دەردەکەوێ کە مردووە یا ماوەیێکی وای بەسەر دابچێ کە پتر لەو ماوەیە لەگوین نیە لە ژیاندا بمێنێ[136] ، دیار کردنی ئەم ماوەیەش دەگەڕێتەوە

---

134 ) المبسوط 30|54 .

135 ) شرح الزرقاني للموطأ 3|257 ، الإستذكار 6|130 ، الأم 7|236 ، المغني لابن قدامة 6|263 .

136) ئەم ماوەیەش بۆ چوونی زۆری تیایەو گەلێکی ناچێتە عەقل و ژیری نیەو و لەگەڵ واقیعا ڕێك ناکەوێ وەك سەدو بیست ساڵ و نەوەت ساڵ و شێست سال ...هتد . بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە بدرێتە دادوەر بە پێی بەرژەوەندی ژنەکەی و گشت لایەنەکانی تر بڕیاری شەرعی واقعی لا بدات .

سەر بۆچوون و بڕیاڕی دادوەری دادگا[137]...

ڕاستیەکەی ئەمەیە دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان میرات و شووکردنەوەی ژنەکەی ون بوو ...چونکە گیر کردنی میرات زیانی کەم ترە لە مانەوەی ژن بەبێ مێردو نەفەقە ... بۆیە دەتوانین بڵێین لە مێردکرنەوەی ژنەکەی پێویستە بە فەرمانی دادوەری ئیمامی عومەر بکەین ئەگەر ژنەکە ئارامی نەگرت و سکالای بۆ دادگا بەرز کردەوە ، لە پاش بڕیاڕی دادگا بە مردنی (حوکمی) ون بوەکە پاش چوار ساڵ بەسەدا چوون چوار مانگ و دە ڕۆژ عیددە بگرێ و شوو بکاتەوە ... لە بەر کێشەی ڕەوشتی ئایینی و بێ گوزەرانی ...

بەڵگەشمان ئەم حەدیسەیە: (عن سعيد بن المسيب أن عمر بن الخطاب ﷺ قال: أيما امرأة فقدت زوجها فلم تدر أين هو" فإنها تنتظر أربع سنين، ثم تنتظر أربعة أشهر وعشرا )[138]. واتە حەزرەتی عەمەر فەرمویەتی: هەر ژنێك مێردی خۆی بزر کرد نەیزانی لە کوێیە ، دەبێ چوار ساڵ چاوەڕوان بێ ، جا چوار مانگ و دە ڕۆژ عیددە دەگرێ ، واتە پاش ئەوە بۆی هەیە شوو بکاتەوە ...چونکە ئارام گرتن لە مێرد نەکردنەوە لای هەندێ ژن زۆر زەحمت و گرانە .

بەڵام ئەگەر ون بوەکە ژنی نەبوو یا ون بوەکە ژن بوو میراتەکەی ئەم کێشەیەی تێدا نیە؛ چونکە ئارام گرتن بۆ وەرگرتنی میرات لە توانا دایەو ئاسانە کێشەکەی زەحمەت و قورس نیە ؛ بۆیە دەتوانن چاوەڕوان بن هەتا ژیانی یا مردنی بە دڵنیایی دەردەکەوێ ... لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر کەوتە دادگاو بڕیاڕی مردنی پێ درا

---

137 ) المبسوط للسرخسي 30|54 ، الحاوي الكبير 8|89 ، المغني لابن قدامة 6|263 .

138 ) موطأ الإمام مالك 2| 575 الحديث رقم 1195، سنن البيهقي الكبرى 7|445 الحديث رقم 15343 .

هەر دەبێ میراتەکەشی دابەش بکرێت ، چونکە هەردوو حوکم ئاسەواری مردنن ، لە مەسەلەیێکدا لێك جودا ناکرێتەوە .

## چۆنیەتی میرات گرتنی ون بوو :

1 ـ ون بوو بە زیندوو دەژمێردرێ بۆیە بەشەکەی بۆ دادەنرێ ...ئەگەر دەرکەوتەوە بەشەی خۆی پێ دەدرێ ، ئەگەر دەرچو مردووە دەبێ لێ بکۆڵدرێتەوە ، ئەگەر دوای میراتلێگیراوی خۆی مردبێ میراتەکە دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکانی خۆی ، ئەگەر پێشی میراتلێگیراوی خۆی مردبوو میرات ناگرێ و بەشەکەی بۆ میراتگرەگانی تر دەگەڕێتەوە هەرکەسە بە ڕێژەی بەشی خۆی . ...

2ـ ئەگەر ون بوو بارنجی گشت خزمەکانی تری گەڵ خۆی دەگات، میراتەکە دابەش ناکرێ هەتا دەردەکەوێ ، ئەگەر هاتەوە میراتەکەی خۆی دەبات ، ئەگەر دەرکەوت مردیە یا بڕیاڕی مردنی دادگایی پێدرا ئەوجا میراتەکە دابەش دەکرێتە سەر خزمەکانی کە میراتگرن ...

وەك یەکێك بمرێ کوڕێکی ون بوو دوو براو خوشکێکی لە پاش بەجی بمێنێ ... گشت میراتەکە بۆ کوڕەکە دادەنرێ چونکە براو خوشك لەگەڵ کوڕ هیچ نابەن . ئەگەر کوڕەکە هاتەوە گشتی دەبات، ئەگەر نەهاتەوە ئەوجا میراتەکە دەکرێتە پێنج بەش ، هەر برایە دووبەش دەبات و خوشکەکەشیان بەشێك ...

3ـ ئەگەر ون بوەوکە بارنجکەری کەمکەرەوە بێ بۆ میراتگرەکانی تر، واتە بەشیان کەم بکاتەوە، میراتگرەکانی تر لایەنی بەشە کەمترەکەیان پێدەدرێت، ئەویش بەشی تەواوی خۆی بۆ هەڵدەگیرێ، ئەگەر هاتەوە ئەوا بەشەکەی خۆی دەبات کە بۆی دانرابوو، ئەوانی تریش هی خۆیان بردووە ، ئەگەر دەرچوو مردوە یا بڕیاڕی مردنی

دادگایی پێ درا ، بەشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکانی تر هەرکەسە بە پێی ڕێژەی بەشی خۆی .

وەك یەکێك بمرێ و دایك و باوك و کوڕیکی ون بووی لە پاش بەجێ بمێنی .. میراتەکە دەکرێتە شەش بەش ، شەشێك بۆ باوك و شەشێکی تریش بۆ دایك واتە بۆ هەردووکیان دوو بەش، چوار بەشیش دەمێنێتەوە بۆ کوڕە ون بوەکە ... ئەگەر هاتەوە میراتەکە دەبا ئەگەر نا دەگەڕێتەوە سەر دایك و باوکی یەکێك بۆ دایکی و سیانیان بۆ باوکی ، واتە کۆی بەشی باوك دەبێتە چوار و هی دایکیش دەبێتە دوو .

## چۆنیەتی میراتگرتن لەماڵی ون بوو:

بۆ دابەش کردنی میراتی ون بوو پێویستە ئەم ڕێنماییانە ڕەچاو بکرێت :

1 ـ میراتی ماڵی مرۆڤی ون بوو دابەش ناکرێت هەتا دەردەکەوێ مردووە یا بڕیاری مردنی دادگایی پێ دەدرێ. چونکە بە پێی بەڵگەی (إستصحاب)و ڕێسای (الیقین لا یزول بالشك ) و ڕیسای (الأصل بقاء ماکان علی ماکان) بە زیندوو دادەنرێ هەتا دەردەکەوێ مردووە یا بڕیاری مردنی دادگایی پێ دەدرێ پاش لێکۆڵینەوەیێکی زۆر ....ئەوجا میراتەکەی دابەش دەکرێ ...

2 ـ ئەگەر دادوەر پاش لێکۆڵینەوەو چەسپان بە بەڵگەی شەرعی بڕیاڕی دا بە مردنی ون بوو لە بەروارێکی ڕابردوو ، میراتگرەکانی کە زیندوون پاش بەرواری مردنەکەی میراتی لێ دەگرن نەك پاش بڕیار دانی دادگا ، واتە ئەگەر یەکێك زیندوو بوبێ لە بەرواری مردنی ون بوو پاشان لە پێش بەرواری بڕیاڕدان بمرێ میراتەکە دەگرێ ...

3ـ ئەگەر مردنەکە بە بەڵگەو لێکۆلینەوە نەچەسپا واتە دەرنەکەوت و دادوەر بڕیاری مردنی دا واتە بە مردووی دانا بۆ بەرژەوەندی خانەوادەکەی، لێرەدا کاتی مردنی لە بەرواری بڕیاری دادوەر دەژمێردرێ ، واتە ئەو میراتگرانەی زیندوون لە پاش بڕیاردان میراتی لێ دەگرن، نەك هی پێشی بڕیار دان ئەگەر نەما بوون بۆ کاتی بڕیارەکە . ئەمەش لای ئیمامی شافیعی و ئەحمەد ، بەڵام لای ئیمامی حەنەفی و مالیك مرنی لە کاتی ون بوونەکەی دادەنرێ نە بڕیارەکە ...

4 ـ ئەگەر ون بوەکە پاش میرات دابەش کردنی دەرکەوتەوەو نەمردبوو ئەو ماڵەی خودەکەی لای میراتگرەکان ماوە بۆی دەگەڕێتەوە ئەوەی نەشماوە هیچ ، واتە داوای قەرەبۆی بۆ ناکرێ . ئەگەر هیچیش نەمابوو هیچی بۆ نیە؛ چونکە بەپێی حوکمی دادگا دابەش کراوە ، ئەمە بۆچوونی حەنەفیەکانە و حەنبەلیەکانە[139] ، بەڵام لای شافیعیەکان دەبێ قەرەبۆ بگرێتەوە[140]...

<u>**میراتی دیل**</u>: ئەگەر بەدیل گیراو ژیان و جێگەی دیارو زانراو بوو ماڵەکەی وەکو خۆی دەمێنێتەوەو دەستی لێ نادرێ هەتا دەگەڕێتەوە ـ کە گەڕایەوە، ماڵ ماڵی خۆیەتی و دەدرێتەوە دەستی ، ئەگەر یەکێکیش لە میراتلێگیراوەکانی مرد میراتی لێ دەگرێو بەشەکەی بۆ دەخرێتە سەر ماڵەکەی و کە هاتەوە لەگەڵ ماڵەکەی تری خۆی دەدرێتەوە دەستی .

بەڵام ئەگەر دەرکەوت مردووە یا کوژراوە ئەوساکە میراتەکەی لە بەرواری مردنی دبێتە میراتی میرات گرەکانی وبەسەریاندا دابەش دەکرێ .

بەڵام ئەگەر ژیان و مردنی نەدیار بوو هیچ خەبەری نەبوو ئەو کاتە هەمان ئەگەرو حوکمەکانی ون بووی بۆ بەکار دێت .

---

139 ) درر الحكام شرح مجلة الأحكام 2|251 . كشاف القناع 4|466 .

140 ) فقه المواريث للاستاذ نظام الدين عبد الحميد ص217 .

# { باسی سێیەم }

## ﴿ میراتی نێرامووك ﴾

نێراموك ئەو كەسەیە كە هەردوو ئەندامی نێرینەیی و مێینەیی هەیە یا تێكەلە یا هیچیانی نیە یا دیار نیە و نازانرێ نێرە یا مێیە[141] .

### چۆنیەتی میراتگرتنی نێرامووك ئەم جۆرە بۆچوونانەی هەیە:

1ـ نێرامووك ئەگەر لایەنی نێرینەی زاڵ تر بوو بە نێر دەژمێردرێ و میراتی پیاوی دەدرێتێ ، ئەگەر لایەنی مێینەی زاڵ تر بوو بەمی دەژمێردرێ و میراتی ژنی دەدرێتێ . یا ئەگەر لەو شوێنەی شێوەی پیاو میزی دەكرد میراتی پیاوی دەدرێتێ، ئەگەر لەو شوێنەی وەكو ژن میزی دەكرد میراتی ژنی دەدرێتێ ، ئەگەر بە هەردوو ئەندام میزی دەكرد بەكام ئەندام میزی زۆر تر بوو یا لە پێشتر بوو بەو لایەن دەژمێردرێ ، ئەم بۆچوونە كۆی (ئیجماعی) زانایانی لەسەرە[142] "

بە بەلگەی ئەو فەرمودەیە: (عن ابن عباس: أن رسول الله ﷺ سئل عن مولود ولد، له قبل وذكر! من أين يورث ؟ فقال النبي ﷺ: يورث من حيث يبول )[143] واتە لە ئیبن وعەباسەوە كە پێغەمبەرﷺ: پرسیاری لێ كرا لە منالێك كە ئەندامی كوڕو كچی

141 ) الحاوي للماوردي 6|168.

142 ) شرح السراجية للشريف الجرجاني ص121، منار السبيل للمالكية للشيخ إبراهيم بن محمد بن ضويان ص460، الحاوي للماوردي 8|168، المغني لابن قدامة 6|253 نقله عن ابن المنذر.

143 ) سنن البيهقي 6|261 الحديث رقم 12298، وهو ضعيف جدا ، انظر | الكامل في ضعفاء الرجال 3|249، تلخيص الحبير 1|128.

هەیە ، چۆن میرات دەگرێ ؟ فەرمووی میرات دەگرێ بە پێی جێگەی میز پێ کردنی .

ئەگەرچی ئەم حەدیسە زۆر لاوازە، بەڵام ئەوە بەهێزی دەکات کە هەر بەم جۆرە لە ئیمامی عەلی ریوایەت کراوەو فەتوای پێ داوە و سەنەدەکەشی ڕاستە[144] .

2ـ بەڵام ئەگەر هیچ لایەنی ژنایەتی یا پیاوەتی دیار نەبوو یا زاڵ نەبوو بەسەر لایەنی تری، واتە وەکو یەك بوون، ئەو کاتە بە نێراموکی کێشەیی (الخنثى المشكل) دادەنرێ...

ئەم جۆرە بۆ میرات گرتنی لای (جمهور) واتە زۆربەی زانایان چاوەڕوان دەکرێ هەتا گەورە دەبێ، ئەگەر نیشانەکانی پیاوەتی لێ دەرکەوت وەك ڕیش وسمێل وتۆی پیاو ئەوا میراتی پیاو دەگرێ ، ئەگەر نیشانەکانی ژنایەتی لێ دەرکەوت وەك مەمك و سوری مانگانەو نیشانەی تری لەم جۆرە، میراتی ژنی دەدرێتی، بەڵام ئەگەر پێش پێگەییشتن (بلوغ) مرد کۆی نیوەی میراتی کوڕو نیوە میراتی کچی دەدرێتێ کە دەکاتە سێ چارەکی بەشی کوڕ[145] .

3 ـ لای حەنەفیەکان نێراموکی کێشەیی کەمترینی باری کورو باری کچی پێ دەدرێ و هیچی بۆ دانانرێ... واتە ئەگەر باری بە مێ دانانی بەشی کەمتر بکا بەمێ دادەنرێ ، ئەگەر باری بە نێر دانانی بەشی کەمتر بکا بە مێ دادەنرێ، هەتا ئەگەر

144 ) تلخيص الحبير 1|128. وقال إسناده صحيح ...

145 ) شرح السراجية للجرجاني ص122 ، منار السبيل ص461 ، الحاوي للماوردي 8|168 ، المغني لابن قدامة 6|254 .

کام لا بێبەشی بکات ئەوی بۆ دادەنرێ ، بەڵام میراتگرەکانی گەڵی لایەنی پتریان بۆ دادەنرێ[146] . واتە بە پێچەوانەی میراتی منالّی ناوسك .

بۆ نمونە ئەگەر یەکێك مردوو کوڕێك و منالێکی نێراموکی میراتگر بوون ، میراتەکە دەکرێتە سێ بەش دوویان بۆ کوڕەکەو یەکێکیشیان بۆ کچەکە ...بەڵام ئەگەر میراتگرەکان بریتی بوون لە مێردو دایك و نێراموکێکی لە دایکو باوکی خۆی ، مێردەکە نیوە دەبات و دایکەکەش سێیەك نێراموکەکە بە برا دەژمێردرێ بۆ ئەوەی ببێتە عەصەبەو پاشماوەکەی ببات ، چونکە ئەگەر بە خوشك بژمێردریت پتر دەبات واتە نیوەی میراتەکە دەبات و مەسەلەکە بەرز دەبێتەوە بۆ حەوت ...

4 ـ لای شافیعیەکانیش ئەگەر هەر هیچ لایەنی دەرنەکەوت میراتی کەمترینی نێرینە یا مێینەی پێدەدرێت پاشماوەکەشی دادەنرێت هەتا دەردەکەوی کامیانە ، ئەگەر دەر چوو ماق ئەوە وەکو پیاو یا وەکو ژن پێی دەدرێت ، ئەگەر هیچ لایەنی دەرنەکەوت (صولح)ی لەگەڵا دەکەن لەسەر بەشەکەی[147] .

واتە ئەگەر یەکێك مردوو کوڕێك و منالێکی نێراموکی میراتگر بوون ، کوڕەکە نیوەی میراتەکە دەبات نێراموکەکەش وا دادەنێین کچە سێیەکی میرات دەبات، شەشێکی میراتەکەی دەمێنێتەوە دادەنرێت هەتا کاتی خۆی، ئەگەر دەرکەوت کچە شەشێکەکە دەدرێتە کوڕەکە ، ئەگەر کوڕ دەرچوو شەشێکەکەی خۆی دەباتەوەو لەگەڵ براکەی یەکسان دەبێت هەر یەکە نیوە .

146 ) شرح السراجية ص123 .

147 ) المهذب 4| 100.

5 ـ بەڵام لای مالیكیەكان و حەنبەلیەكان دەڵێن نێرامووكی كێشەیی (الخنثى المشكل) نیوەی بەشی كوڕو نیوەی بەشی كچ وەردەگرێ[148].واتە نیوەی بەشی هەردووكیان وەردەگرێ، ئەگەر بەشی كوڕ چوار بوو و بەشی كچ دوو بو ، سێ بەشی بۆ دادەنرێ كە كۆی نیوەی بەشی هەردوكیانە .

لەوانەیە ئەمە باشترین بۆچوون بێت؛ لەبەر ئەوەی گشتیان ئەم بۆچوونەیان هەیە ئەگەر پێشی بلۆغ بوون بمرێ یا میرات دابەش بكرێ؛ لەلایەكی ترەوە: تێكەڵی نێرو مێیەكەی تێكەڵی بەشەكانیشیان ڕادەكێشێ .چونكە هەردووكیان عیللەتی بەشەكانن. واتە كە نیوەی نێرە نیوەی بەشی نێر دەبات ، كە نیوەی تریشی مێیە نیوەی بەشی مێ دەبات ، كۆی هەردووكیان دەكاتە ( $\frac{3}{4}$ ) واتە سێ چارەگی بەشی نێر ...

6 ـ ئەگەر نێراموكەكە بەشی بە نێرینەیی و مێینەیی وەكو یەك بوو نەدەگۆڕا بە هەردوو لایەن هەمان بەشی بەردەكەوت ، ئەوە هیچ كێشە نیە میراتەكە دابەش دەكرێ و بەشەكەی پێ دەدرێ، لەگەڵ میراتگرەكانی تر .

148 ) منح الجليل 9|707 ، المغني لابن قدامة 6|254 .

# { بەشی شەشەم }

## ﴿ لێ دەرچون و سرینەوەکان ( التخارج والمناسخات ) ﴾

وا پێویستە ئەم دوو بابەتە لێدەرچوون و سڕینەوە لەم دوو باسەی خوارەوە ڕوون بکرێتەوە ...

## { باسی یەکەم }

## ﴿ لێ دەر چوون ﴾

**لێ دەرچوون:** ئەوەیە کە یەکێك لە میراتگرەکان لە بەشی خۆی بێتە خوارەوە بۆ میراتگرەکانی هاوبەشی، بەرامبەر بە فرۆشتنی یا قەرەبۆ کردنەوەی بەشەکەی یا بەبێ بەرامبەر لەبەشەکەی خۆش بێت ، لە ڕێی خوا بێ یا بە پیاوەتی.

ئەم کارە پێویستە تەنیا لە نێوان میراتگرەکاندا بێت، مەرجیش نیە خودی ماڵەکە دیار بێت یا دەستنیشان کرابێت ، چونکە لەسەر بەش دەکرێت نەك لەسەر ماڵ[149].

لە لایەکی ترەوە لایەنەکانی ڕێك کەوتنەکە دەبێ ئەم مەرجانەیان لێ بێتە جێ:

1. مەرجی شایەنیەتی گرێبەستیان هەبێ[150] .
2. لەسەر بنەمای ڕەزامەندی دابمەزرێ واتە فشار لە سەر هیچ لایەك نەبێ.

---

149 ) احكام الميراث والوصية للدكتور مصطفى الزلمي ص115 .

150 ) وەك: پێگەییشتن و عەقل و سەرپشکی ، ( البلوغ والعقل والإختيار)

3- بەجێماوەکەش بە قەرز دانەپۆشرابێ[151] . چونکە هیچ نامێنێتەوە ببێتە میرات بۆ ئەوەی لێ دەرچونی لەسەرا بکرێت .

**بەڵگەکانی دروستی لێ دەرچوون:** لێدەرچوون بە ڕەزامەندی گشت لایەنەکان ڕێك کەوتنە کە پێی دەڵێن (صولح)، ئەویش بەپێی قورئان و سوونەت دروستە بەم جۆرە:

1- لە سورەی ئەنفالدا دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (1)﴾ واتە خۆتان لە سەرپێچی کردنی خوا بپارێزن و لە نێوان خۆتانا ڕێك بکەون و گوێڕایەلی خواو پێغەمبەر بکەن ئەگەر بە ڕاستی باوەڕدارن .

2- هەروەها لە سورەی نیسادا دەفەرموێ: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ....(128)﴾ واتە ڕێك کەوتن باشترە .

3- پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الصُلحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلا صُلْحًا أَحَلَّ حَرَامًا أَوْ حَرَّمَ حَلالا)[152] . واتە ڕێك کەوتن دروستە لە نێوان موسوڵماناندا تەنیا ڕێك کەوتنێك نەبێ حەڕام حەلال بکاو حەلال حەڕام بکات .

4- ئیجماعی زانایان دامەزراوە لەسەر ئەوەی کە ڕێك کەوتن لەسەر شتی حەلال دروستە .

**وێنەکانی لێ چوونەدەر:** لێچوونەدەر چەند وێنەیێکی هەیە بەم جۆرەی کە دێ :

**وێنەی یەکەم:** یەکێك لە میراتگرەکان لە میراتەکە دەرچێت بەشی خۆی بۆ

151 ) المصدر نفسه ..

152 ) صحيح ابن حبان 11|448 الحديث رقم 5091 . صححه ابن حبان والحاكم | الدراية في تخريج احاديث الهداية 2|180 الحديث رقم 847 .

میراتگرێکی تر بەجێ بێلیت بەرامبەر بە چەندێك پارە پێی بدا ، واتە کڕیارەکە بەشی خۆی و لێچووەدەرەکەی بۆ کۆ دەبێتەوە ، جا لێرەدا میراتەکە وەکو خۆی دابەش دەکرێ ، باشان بەشی میراتگرە لێچووەدەری فرۆشیار دبێتە هی میراتگرەکەی کڕیار لەگەڵ بەشەکەی خۆی کۆ دەکرێتەوە بۆی ...وەك:

یەکێك مردوو میرات گرەکانی باوکی و کچێکی و ژنەکەی بوون ، ژنەکە بەشی خۆی دا باوکەکە کە خەزوریەتی بەرامبەر بە دە ملیۆن دینار ، مەسەلەکە بەم جۆرە دەبێت :

| باوك | کچ | کچی کوڕ | ژن | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{6}$ + ماوەکە | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{8}$ | (24) |
| 1+4 + | 12 + | 4 + | 3 = | |

لێرەدا بەشی ژنەکە کە(3) بەشە دەدرێتە باوکەکە بەرامبەر بەو پارەیەی داویەتی واتە بەشی باوك دەبێتە (8). ژنەکەش پارەکەی خۆی لە خەزورەکەی وەر دەگرێت.

<u>وێنەی دووەم</u>: یەك لە میراتگرەکان لە گەڵ هەموو میراتگرەکانی تر ڕێك بکەوێ کە شتێکی دیار کراو لە میراتەکە بۆ ئەو بێت و لێ بچێتە دەرەوە و ئەوی تر بەسەر میراتگرەکانی دیکە دابەش بکرێت ، وەك ژنێك بمرێ و میراتگرەکانی مێردو کوڕێك و کچێکی بن ، شێست دۆنمە زەوی و خانوێکی لەپاش بەجێ مابێت ، مێردەکە لەگەڵ کوڕو کچەکە ڕێك بکەوێت لەسەر ئەوەی کە خانوەکە بۆ ئەو بێت و لێبچێتە دەرەوەو ئەوی تر بۆ میراتگرەکانی تر بێت... لێرەدا پاش ڕەزامەندیان خانوەکە دەدرێتە مێردەکە و زەویەکە دەکرێتە سێ بەش دوو سێیەك بۆ کوڕەکەو سێیەکەی تر بۆ کچەکە .

**وێنەی سێیەم:** ئەم وێنەیە سێ حاڵەتی هەیە[153]:

**حاڵەتی یەکەم:** لێچوەدەر ڕێك بکەوێت لەگەڵ میراتگرەکانی تر کە هەریەکە بە ڕێژەی بەشی میراتی خۆی بەرامبەری بداتێ بۆ کڕینەوەی بەشەکەی ، وەك ئەگەر میراتگرەکان ژنێك ودوو برای دایکی و برایەکی دایکو باوکی بن ، بڵێین میراتەکەش (36) دۆنمە زەوی بوو . مەسەلەکە بەم جۆرە دەبێ:

| ژن | 2برای دایکی | برای دایکوباوکی | ئەصلی مەسەلەکە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{3}$ | پاشماوەکە | (12) |
| 3 + | 4 + | 5 = | |

واتە میراتەکە دەکرێتە (12) بەش . 36÷12=3 بەهای یەك بەش .

3×3 =9 دۆنم بەشی ژنەکە پێش لێچوونەدەری .

4×3 =12 دۆنم بەشی هەردوو برای لە دایك.

5×3 =15 دۆنم بەشی برای لە دایك و باوك .

بەڵام کە ژنەکە لێچوە دەرەوە بەرامبە بەو نرخەی پێیان داوە هەر کەسە بە گوێرەی ڕێژەی بەشی خۆی ، زەویەکە تەنیا دابەش دەکرێتە سەر بەشەکانی براکانی هەردوو بەر کە (9) بەشە بەم جۆرە:

---

153) أحكام الميراث والوصية للأستاذ الدكتور مصطفى الزلمي ص116 . فقه المواريث للأستاذ نظام الدين عبد الحميد ص237 .

36 ÷ 9 = 4 دۆنم بەهای یەك بەش .

4 × 4 = 16 دۆنم هی دووبرایەکەی لە دایك هەر یەکە 8دۆنمی بەردەکەوێ .

4 × 5 = 20 دۆنم بەشی برای لە دایك و باوکە .

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر میرات گرەکانی تر پێکەوە وەکو یەك واتە بە یەکسانی بەرامبەریان دایە لێچوە دەرەوەکە نەك هەر کەسە بە پێی ڕێژەی بەشی خۆی ، لێرەدا بەشی لێچوە دەرەکە بەیەکسانی دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکانی تر .

کەوابوو لەم حاڵەتە لە نموونەی پێشودا بەشی ژنەکە کە (9) دۆنم بوو دەکرێتە دوو بەش ، چوارو نیوی بۆ دوو براکەی دایکی جا بەشیان دەبێتە 16+ 5,4 = 5 ،20 دۆنم . چوارو نیوی تریش بۆ برای دایك و باوکی جا بەشی دەبێتە 5,4+15 = 5، 19 دۆنم .

**حاڵەتی سێیەم:** ئەوەیە کە میراتگرەکانی تر نە بەیەکسانی نە بە پێی ڕێژەی بەشەکانیان بەرامبەر بدەنە لێچوەدەرەوەکە ، بەڵکو هەر کەسە میقدارێکی بداتێ جیاجیا بن لەگەڵ یەکتری ، کەوا بوو لەم حاڵەتەدا هەر کەسە بەقەدەر ئەو پارەی کە دایەتی بەشی لێچوەدەرەکە دەبا ، ئەوەی سێیەکی داوە سێیەك دەباو ئەوەی چارەکی دایە چارەگی دەباو ، ئیتر بەم جۆرە و دەخاتە سەر بەشەکەی خۆی ...

# { باسی دووەم }

## ﴿ سڕینەوەکان (المناسخات) ﴾

سڕینەوە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (مناسخە) لە (نسخ)ـەوە وەرگیراوە واتە لابردن ، بریتیە لەوەی کە یەکێك مردبێ و هێشتا میراتەکەی دابەش نەکرابێ ، پێش دابەش کردنی میرات یەك لە منالەکانی بمرێت، جا بەشەکەی مردووی یەکەم دەگوازرێتەوە بۆ میراتگرەکانی مردووی دووەم .

بۆیە ناوی نراوە سڕینەوە (مناسخە) چونکە دوو مەسەلەی بۆ دادەنرێ یەکەمیان بۆ میراتگرەکانی مردووی یەکەم کە لەکاتی خۆیا بۆیان دابەش نەکراوە ، دووەمیان بۆ میراتگرەکانی مردووی دووەم ، پاشان مەسەلەکەی دووەم هی یەکەم دەسڕێتەوە واتە لای دەبا بۆ ئەوەی میرات گرەکانی چینی دووەم بەشەکانیان بە تەواوی وەربگرن .

ئەگەر مردووەکەی دووەم میراتگرەکانی هەمان میرات گری یەکەم بوون ، هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ و تەنیا ئەوە نەبێ میراتگرێکی لێ کەم دەبێتەوە کە مردووەکەی یەکەمە ...

بۆ نمونە گەر یەکێك بمرێ سێ کوڕو سێ کچی لە پاش بەجێ بمێنێن لەگەڵ حەفتا ملیۆن دینار ، بەڵام پێش دابەش کردنی میراتەکە بەسەریاندا یەك لە کوڕەکان مرد ، دەمینێنەوە دوو کوڕو سێ کچ، لێرەدا هیچ ناگۆڕێ بۆیە وا دەژمێرین کە ئەم کوڕە هەر نەبوەو بۆیە میراتەکە دابەش دەکەینە سەر دوو کوڕو سێ کچ ...واتە دەکرێتە حەوت بەش هەر کوڕە دوو بەش دەبات و هەر کچە بەشێك ...

بەم جۆرە : 70 ÷ 7= 10 ملیۆن بەهای یەك بەش ...

10 × 2 = 20 ملیۆن دینار بۆ هەر کوڕێك واتە بۆ هەردووکیان (40) ملیۆن ...

10 ×1 = 10 ملیۆن دینار بۆ هەرکچێك ،واتە بۆ هەرسێکیان (30) ملیۆن .

ئەمە کێشەی تیادا نیە، بەڵام کێشە لەوەدایە کە ئەگەر میراتگرەکانی مردووی دووەم جودا بوون لەگەڵ هی یەکەم ، یا هەندێکیان جودا بوون و هەندیکیشیان هەمان میراتگری یەکەم بوون ، لێرەدا بۆ ڕێك خستنی مەسەلەکانیان چەند حالەتێکی هەیە:

**حالەتی یەکەم:** ئەگەر ژمارەی بەشەکانی مردوو لە مەسەلەی یەکەمدا یەکسان بوو لەگەڵ ژمارەی ئەصلی مەسەلەی دووەم، هیچ کێشە دروست نابێ، چونکە بەشەکانی ئەم مردووە دابەش دەکرێتە سەر میراتگرەکانی لە مەسەلەی دووەمدا، بەبێ ئەوەی پێویستیمان بە دامەزراندنی مەسەلەیێکی تر بێت .

وەك ژنێك بمرێ، (18) ملیۆن دیناری لەپاش بەجێ بمێنێ، میراتگرەکانیشی بریتی بن لە مێردی و دایکی و مامی ، مەسەلەکەیان بەم جۆرەیە:

| مێرد | دایك | مام | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{3}$ | پاشماوەکە | (6) |
| 3 + | 2 + | 1 = | |

18ملیۆن ÷ 6 = 3 ملیۆن بەهای یەك بەش ، واتە مێردەکە 3×3= 9 ملیۆنی بەردەکەوێ، دایکەکەش 2×3=6 ملیۆن و مامەکەش 1×3=3 سێ ملیۆنی بەر دەکەوێ .

بەڵام ئەگەر پێشی دابەش کردنی ئەم میراتە مێردەکەشی بمرێ و کوڕێك و کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێ ، بەم جۆرە دەبێ:

| کوڕ | کچ | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|
| 3 | 1 | 3 |

لێرەدا دەبینین ئەصلی مەسەلەکەی دووەم یەکسانە لەگەڵ بەشی مێردەکە لە مەسەلەی یەکەمدا ، کەوابوو هەر ئەم بەشە دابەش دەکەینە سەر کوڕو کچەکە، دویان بۆ کوڕەکەو یەکیان بۆ کچەکە، چونکە بەشی مێردەکە کە باوکیان بوو (9) ملیۆن بوو ، شەش ملیۆن بۆ کوڕەکەو سیانیشی بۆ کچەکە .

حالەتی دووەم: ئەگەر لە نێوان بەشەکانی مردوو لە مەسەلەی یەکەمدا و بنچینەی مەسەلەی دووەم گونجاوی (وفق) هەبوو ، واتە هەردووکیان بەسەر ژمارەیەکدا دابەش دەکران ،دەبێ (وفق)ی مەسەلەی دووەم لە بنچینەی مەسەلەی یەکەم بدەین ، ئەنجامەکەی پێی دوترێ مەسەلەی کۆکراوە ، جا ژمارەی مەسەلەی کۆکراوە لە بەشەکانی هەر میراتگرێك لە مەسەلەی یەکەم دەدەین جگە لە بەشی مردوو بۆ زانینی بەشی هەر میراتگرێك لە مەسەلەی کۆکراوە .

پاشان وفقی بەشەکانی مردووی دووەم لە مەسەلەی یەکەمدا لە بەشەکانی هەر میراتگرێك لە مەسەلەی دووەم دەدەین ، بۆ ئەوەی هەر میراتگرە بەشی لە مەسەلەی کۆکراوە دیار بێت .

بۆ نمونە ئەگەر یەکێك مرد ، دوو کوڕو دوو کچی میراتگر بوون ، پێش دابەش کردنی میراتەکە یەك لە کوڕەکانی مرد ، تەنیا ژنی لەگەڵ براکەی و دووخوشکەکەی میراتگر بوون ، مەسەلەکە بەم جۆرە دەبێ :

| 2 کوڕ | | 2 کچ | | بنچینەی مەسەلەکە |
|---|---|---|---|---|
| 4 | + | 2 | = | 6 |

واتە دوو کوڕەکە چوار بەش وەردەگرن هەریەکە دوو بەش ، دوو کچەکەش دوو بەش وەردەگرن هەریەکە بەشێك ... جا با بێینە سەر مەسەلەی دووەم کە کوڕو کچەکان خوشك و برانە لەگەڵ ژنەکە دەبنە میراتگر:

| ژن | | برایەك | دووخوشك | | بنچینەی مەسەلە |
|---|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | | پ | | | (4) |
| 1 | + | 3 | | = | |

4= 4×1    12= 4×3 بنچینەی مەسەلەکە بوە (16)

لێرەدا دەبینین بەشی براو دوو خوشکەکە دابەش نابێتە سەریان ، بۆیە مەسەلەکە پێویستی هەموارکردنە ، کوڕەکەمان بە دوو کچ ژمارد هەتا ژمارەی سەرەکان ببێتە (4)، جا مەسەلەکەمان لە(4)دا بوە (16)، جا بەشی ژنەکە بوە (4) و بەشی براو

خوشکەکانیش بوە (12) ، شەش بۆ کوڕەکە وشەشەکەی تریش بۆ هەردوو کچەکان ، کۆی بنچینەی مەسەلەکە بوە (16) .

لێرەدا کە بنچینەی مەسەلەی یەکەم (6) بوو هی دووەم (16)، ڕێککەوتن (وفق) لە نێوانیاندا هەیە بە نیوە، واتە هەردووکیان دابەشی دوو دەبن ، بۆیە نیوەی بنچینەی دووەم کە (8)ـە لە بنچینەی یەکەم دەدەین کە (6)ـە دەبێتە (48) پێی دەڵێن مەسەلەی کۆکراوە. جا دیێن هەشتەکە لە بەشەکانی مەسەلەی یەکەم دەدەین بەم جۆرە :

2 × 8 = 16 بەشی کوڕە زیندوەکە ، کە بوە برا لە مەسەلەی دووەم .

1 × 8 = 8 بەشی کچکەی یەکەم . کە بوە خوشك لە مەسەلەی دووەم .

1 × 8 = 8 بەشی کچی دووەم . کە بوە خوشك لە مەسەلەی دووەم .

پاشان دێینەوە سەر مەسەلەی یەکەم ، ڕێکەوتی (وفق)ی کوڕە مردوەکە لە مەسەلەی یەکەمدا (1)ـە ..لە بەشەکانی مەسەلەی دووەم دەدەین بەم جۆرە :

4 × 1 = 4 بەشی ژنەکە .

6 × 1 = 6 بەشی برایەکە کە لە مەسەلەی یەکەمدا کوڕ بوو .

6 × 1 = 6 بەشی هەردوو خوشکەکان کە لەمەسەلەی یەکەمدا کچی مردووی یەکەم بوون . واتە هەریەکە (3)یان بەر دەکەوێ .

دوای ئەوە دێین ئەو میراتگرانەی لە هەردوو مەسەلەکەدا میراتیان گرتووە بەشەکانیان کۆ دەکەینەوە بەم جۆرە :

16 + 6 = 22 بەشی کوڕە زیندوەکە کە لە هی یەکەمدا برا بوو .

8 + 3 = 11 بەشی کچی یەکەم کە بوە خوشك لە مەسەلەی دوەمدا .

8 + 3 = 16 بەشی کچی دوەم کە بوە خوشك لە مەسەلەی دوەمدا.

ئێستا ئەگەر گشت بەشەکانی میراتگرەکانی مەسەلەی دووەم و یەکەم لە گەڵ بەشی ژنەکە کۆ بکەینەوە دەکاتە(48) بەش ، واتە چارەسەرەکەمان ڕاستە .

**تێبینی:** ئەگەر زیاتر لە مەسەلەیەك دروست بوو لەبەر دوبارە بوونەوەی مردووی سێیەم و چوارەم و ...هتد بە قەدەر دوبارە بوونەوەی مردوو زیاتر مەسەلە دروست دەکەین و لەگشتیان مەسەلەی کۆکراوە پێك دێنین هەر بەم جۆرە چارەی دەکەین .

**حالەتی سێیەم:** ئەوەیە کە لە نێوان بەشەکانی مردووی دووەم لەمەسەلەی یەکەمدا ونێوان بنچینەی مەسەلەی دووەمدا جیاوازی هەبێ واتە ڕێکەوتن نەبێ ، بۆیە بنچینەی مەسەلەی دووەم لە بنچینەی مەسەلەی یەکەم دەدەین ، پاشان لە گشت بەشەکانی مەسەلەی یەکەم دەدەین ، جا بەشی مردووی دووەم لە مەسەلەی یەکەم لە بەشەکانی هەموو میراتگرەکان لە مەسەلەی دووەم دەدەین ، وەك لە حالەتی پێشودا کرا .

لێرەدا میراتگرەکانی لە هەردوو مەسەلەدا دووبارە دەبنەوە بەشەکانی ڕاستیان لە کۆتا مەسەلەی سڕینەوە دەردەکەوێ ،

ئەگەر یەکێك مردو میراتگرەکانی ژنی و خوشکێکی لە دایك و باوك و خوشکێکی لە باوك و خوشکێکی لە دایك بوون ، پاشان خوشکەکەی لە دایك وباوك مرد، مێردو خوشکی لە باوك و خوشکی لە دایك میراتگر بوون ، ئایا هەر یەکە بەشی چەندە .

**مەسەلەی یەکەم:**

| ژن | خوشکی لە دایك و باوك | خوشکی لە باوك | خوشکی لە دایك | بنچینە |
|---|---|---|---|---|
| $\frac{1}{4}$ | $\frac{1}{3}$ | $\frac{1}{6}$ | $\frac{1}{6}$ | (12) |
| 3 + | 6 + | 2 + | 2 = سەرکەوت بۆ (13) | |

**مەسەلەی دووەم:**

| مێرد | خوشکی باوکی | خوشکی دایکی | بنچینەی مەسەلە |
|---|---|---|---|
| $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{2}$ | $\frac{1}{6}$ | 6 |
| 3 | 3 | 1 = سەرکەوت بۆ | 7 |

لەبەر ئەوەی بنچینەی مەسەلەکان ڕێکەوتیان لە نێواندا نیە هەردووکیان وەکو خۆی لێك دەدین :

13 × 7 = 91 مەسەلەی کۆکراوە .

جا دێین بنچینەی مەسەلەی دووەم لە بەشەکانی هی یەکەمیش دەدەین جگە لە مردووەکە کە خوشکەکەی لەدایك و باوکە : .

3 × 7 = 21 بەشی ژنەکە .

2 × 7 = 14 بەشی خوشکی لە باوك لە مەسەلەی یەکەمدا .

2×7= 14 بەشی خوشکی لە دایك لەمەسەلەی یەکەمدا . .

جا دێین بەشی مردوەكەی دووەم لە بەشەكانی میراتگرانی مەسەلەی دووەم دەدەین بەم جۆرە:

6 × 3 = 18 بەشی مێرد لە مەسەلەی دووەمدا .

6 × 3 = 18 بەشی خوشكی لە باوك لە مەسەلەی دووەمدا .

6 × 1= 6 بەشی خوشكی لە دایك لە مەسەلەی دووەمدا .

پاش ئەوە دێین بەشەكانی میراتگراوەكانی لە هەردوو مەسەلەكە دووبارە بوینەوە كۆ دەكەینەوە.

14 + 18 = 32 بەشی خوشكی لەباوك .

14 + 6 = 20 بەشی خوشكی لەدایك .

# (کۆتایی)

سوپاس هەر بۆ خوا کە یارمەتی دام بۆ تەواو کردنی نووسینی ئەم کتێبە، لام وایە هەر ئەوەندە بەو قەوارەیە بەسە بۆ پێویستی فێربوون و دامەزرانی بنەمای زانستی میرات لای خوێنکارانی خۆشەویست و هەرکەسێکی بیەوێ فێری بنەماو ڕێسایەکانی سەرەکی میرات ببێت، چونکە ئەمەم تەنیا بۆ فێرکردن وفێربوونی قوتابیان نووسیوە ، بۆ ئەوەم نەنووسیوە وەکو توێژینەوە بگەمە ئەنجامی زانسی ڕاستر، ئەگەر چی لە هەندێ جێگە بۆچوونی خۆم دەر بڕیوەو ئەوەی پێم ڕاسترە بە بەڵگە پەسندم کردووە، وابزانم ئەوەندە پێویست بە جێ دەگەینێ ، ئەوەی پشووشی درێژەو هەوڵی پتر دەدا دەتوانێ بچێتە ناو قووڵی و فراوانی ئەم زانستە جێی شانازی و سوپاسە لێی ببێتە پسپۆڕو کەلکی زیاتر بە ڕۆڵ و بزاڤی ئەم زانستە بگەیێنێ .

لەگەڵ ئەوەشا هیچ بەرهەمێکی مرۆیی بێ کەم و کورتی نابێ ، تەنیا هەر کاری خوا تەواووەو بێ کەم وکورتیە ... داوام لە خوایە کە لە کەم و کورتیم ببوورێ‌و لە گوناهانم خۆش بێت و ئەم کارەم بخاتە تەرازووی چاکەم بۆ ڕۆژی خۆی ، تکام وایە خوێنەرانی بە ڕێزیش لە هەڵەم ببوورن و ئاگاداری کەم و کورتیم بکەنەوە و ڕێنمایی هەموارکردنی ئەم بەرهەمەم بکەن بۆ چاپێکی تر ، ئیتر خوا هەمووومان سەرکەوتوو بکات لە دونیاو قیامەت ...

پ .د . ئەحمەد شێخ موحەممەد بالیسانی

هەولێر: 26|شعبان| 1435هـ - 24|6|2014م .

# المصادر

## بعد القرآن الكريم

1 ـ الاستذكار الجامع لمذاهب فقهاء الأمصار، تأليف: أبو عمر يوسف بن عبد الله بن عبد البر النمري القرطبي، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 2000م، الطبعة: الأولى، تحقيق: سالم محمد عطا–محمد علي معوض .

2 ـ الأم، تأليف: محمد بن إدريس الشافعي أبو عبد الله، دار النشر: دار المعرفة – بيروت – 1393، الطبعة: الثانية .

3 ـ أحكام الأسرة في الفقه الإسلامي ـ فقه المواريث ـ نظام الدين عبد الحميد ـ كلية الشريعة ـ بغداد ط1 1406هـ ـ 1986م . طبع على نفقة وزارة التعليم العالي .

4 ـ أحكام الميراث والوصية في الفقه الإسلامي المقارن والقانون للأستاذ الدكتور مصطفى إبراهيم الزلمي ط2 ،شركة الخنساء للطباعة ، على نفقة وزارة التعلم العالي .

5 ـ الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف على مذهب الإمام أحمد بن حنبل، تأليف: علي بن سليمان المرداوي أبو الحسن، دار النشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، تحقيق: محمد حامد الفقي .

6 ـ البحر الرائق شرح كنز الدقائق، تأليف: زين الدين ابن نجيم الحنفي، دار النشر: دار المعرفة – بيروت، الطبعة: الثانية .

7 ـ بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، تأليف: علاء الدين الكاساني، دار النشر: دار الكتاب العربي – بيروت – 1982، الطبعة: الثانية .

8 ـ بداية المجتهد ونهاية المقتصد، تأليف: محمد بن أحمد بن محمد بن رشد القرطبي أبو الوليد، دار النشر: دار الفكر – بيروت .

9 ـ بەش كردنی میرات لە شەریعەتی ئیسلام و یاسادا ، دكتور محمد مەلا ئەحمەد گەزنی ، چاپخانەی ئیرشاد ـ بەغدا ، 1977م ، لەسەر نەفەقەی كۆڕی زانیاری كورد .

10 ـ تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق، تأليف: فخر الدين عثمان بن علي الزيلعي الحنفي.، دار النشر: دار الكتب الإسلامي. - القاهرة. - 1313هـ.

11 ـ تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي، تأليف: محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري أبو العلا، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت .

12 ـ تلخيص الحبير في أحاديث الرافعي الكبير، تأليف: أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني – المدينة المنورة – 1384 – 1964، تحقيق: السيد عبدالله هاشم اليماني المدني.

13 ـ التقرير والتحرير في علم الأصول، تأليف: ابن أمير الحاج. ، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1417هـ – 1996م .

14 ـ الجامع الصحيح المختصر، تأليف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، دار النشر: دار ابن كثير ، اليمامة – بيروت – 1407 – 1987، الطبعة: الثالثة، تحقيق: د. مصطفى ديب البغا.

15 ـ الجامع الصحيح سنن الترمذي، تأليف: محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي، دار النشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – -، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون .

16 ـ حاشية إعانة الطالبين على حل ألفاظ فتح المعين لشرح قرة العين بمهمات الدين، تأليف: أبي بكر ابن السيد محمد شطا الدمياطي، دار النشر: دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع – بيروت .

17 ـ حاشية رد المختار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار فقه أبو حنيفة، تأليف: ابن عابدين. ، دار النشر: دار الفكر للطباعة والنشر. - بيروت. - 1421هـ - 2000م .

18 ـ الحاوي الكبير في فقه مذهب الإمام الشافعي وهو شرح لمختصر المزني لابي الحسن علي بن محمد بن حبيب الماوردي البصري ، بتحقيق الشيخ على محمد معوض والشيخ عادل أحمد عبد الموجود ـ دار الكتب العلمية ـ بيروت 1419هـ ـ 199هـ .

19 ـ الخرشي على مختصر سيدي خليل، تأليف: ، دار النشر: دار الفكر للطباعة – بيروت.

20 ـ خلاصة البدر المنير في تخريج كتاب الشرح الكبير للرافعي، تأليف: عمر بن علي بن الملقن الأنصاري، دار النشر: مكتبة الرشد – الرياض – 1410، الطبعة: الأولى، تحقيق: حمدي عبد المجيد إسماعيل السلفي .

21 ـ درر الحكام شرح مجلة الأحكام، تأليف: علي حيدر، دار النشر: دار الكتب العلمية – لبنان / بيروت، تحقيق: تعريب: المحامي فهمي الحسيني .

22 ـ الذخيرة، تأليف: شهاب الدين أحمد بن إدريس القرافي، دار النشر: دار الغرب – بيروت – 1994م، تحقيق: محمد حجي.
23 ـ الروض المربع شرح زاد المستقنع، تأليف: منصور بن يونس بن إدريس البهوتي، دار النشر: مكتبة الرياض الحديثة – الرياض – 1390.
24 ـ سنن ابن ماجه، تأليف: محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني، دار النشر: دار الفكر – بيروت –، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي .
25 ـ سنن أبي داود، تأليف: سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني الأزدي، دار النشر: دار الفكر –، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد .
26 ـ السنن الكبرى، تأليف: أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1411 – 1991، الطبعة: الأولى، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري ، سيد كسروي حسن.
27 ـ السنن الكبرى، تأليف: أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1411 – 1991، الطبعة: الأولى، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري ، سيد كسروي حسن .
28 ـ سنن الدارقطني، تأليف: علي بن عمر أبو الحسن الدارقطني البغدادي، دار النشر: دار المعرفة – بيروت – 1386 – 1966، تحقيق: السيد عبد الله هاشم يماني المدني .
29 ـ شرح الزرقاني على موطأ الإمام مالك، تأليف: محمد بن عبد الباقي بن يوسف الزرقاني، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1411، الطبعة: الأولى .
30 ـ شرح السراجية في علم الفرائض للإمام العلامة علي بن محمد بن علي الجرجاني المعروف بالسيد الشريف 816هـ مطبعة وزارة الأوقاف العراقية ـــ1399هـ ـ 1978م .
31 ـ شرح فتح القدير، تأليف: كمال الدين محمد بن عبد الواحد السيواسي، دار النشر: دار الفكر – بيروت، الطبعة: الثانية .
32 ـ شرح النووي على صحيح مسلم ، تأليف: أبو زكريا يحيى بن شرف بن مري النووي، دار النشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت – 1392، الطبعة: الطبعة الثانية.

33 ـ صحيح مسلم، تأليف: مسلم بن الحجاج أبو الحسين القشيري النيسابوري، دار النشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي .
34 ـ الفواكه الدواني على رسالة ابن أبي زيد القيرواني، أحمد بن غنيم بن سالم النفراوي المالكي، دار الفكر– بيروت – 1415.
35 ـ قواعد الفقه، تأليف: محمد عميم الإحسان المجددي البركتي، دار النشر: الصدف بيلشرز– كراتشي،ط1 1407هـ – 1986م .
36 ـ كشاف القناع عن متن الإقناع، تأليف: منصور بن يونس بن إدريس البهوتي، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1402، تحقيق: هلال مصيلحي مصطفى هلال .
37 ـ كفاية الأخيار في حل غاية الإختصار، تأليف: تقي الدين أبي بكر بن محمد الحسيني الحصيني الدمشقي الشافعي، دار النشر: دار الخير – دمشق – 1994، الطبعة: الأولى، تحقيق: علي عبد الحميد بلطجي و محمد وهبي سليمان.
38 ـ كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، تأليف: علاء الدين علي المتقي بن حسام الدين الهندي، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1419هـ–1998م، الطبعة: الأولى، تحقيق: محمود عمر الدمياطي.
39 ـ المبسوط، تأليف: شمس الدين السرخسي، دار النشر: دار المعرفة – بيروت .
40 ـ مجلة الأحكام العدلية، تأليف: جمعية المجلة، دار النشر:كارخانه تجارت كتب، تحقيق: نجيب هواويني.
41 ـ المجموع، تأليف: النووي، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1997م .
42 ـ المحلى، تأليف: علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الظاهري أبو محمد، دار النشر: دار الآفاق الجديدة – بيروت، تحقيق: لجنة إحياء التراث العربي .
43 ـ المختصر في أصول الفقه على مذهب الإمام أحمد بن حنبل، تأليف: علي بن محمد بن علي البعلي أبو الحسن، دار النشر: جامعة الملك عبد العزيز – مكة المكرمة، تحقيق: د. محمد مظهر.
44 ـ المدونة الكبرى، تأليف: مالك بن أنس، دار النشر: دار صادر – بيروت .
45 ـ مسائل أحمد بن حنبل رواية ابنه عبد الله، تأليف: عبد الله بن أحمد بن حنبل، دار النشر: المكتب الإسلامي – بيروت – 1401هـ 1981م، الطبعة: الأولى، تحقيق: زهير الشاويش .

46 ـ المستدرك على الصحيحين، تأليف: محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1411هـ – 1990م، الطبعة: الأولى، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا .

47 ـ المستصفى في علم الأصول، تأليف: محمد بن محمد الغزالي أبو حامد، دار النشر: دار الكتب العلمية – بيروت – 1413، الطبعة: الأولى، تحقيق: محمد عبد السلام عبد الشافي .

48 ـ مسند الروياني، تأليف: محمد بن هارون الروياني أبو بكر، دار النشر: مؤسسة قرطبة – القاهرة – 1416، الطبعة: الأولى، تحقيق: أيمن علي أبو يماني .

49 ـ مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، تأليف: محمد الخطيب الشربيني، دار النشر: دار الفكر – بيروت ـ المغني في فقه الإمام أحمد بن حنبل الشيباني، تأليف: عبد الله بن أحمد بن قدامة المقدسي أبو محمد، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1405، الطبعة: الأولى .

50 ـ منار السبيل بحاشية الأنوار على منار السبيل من إرواء الغليل للشيخ إبراهيم بن محمد بن ضويان بتخريج محمد ناصر الدين الألباني ـ المكتب الإسلامي ـ ط11421هـ ـ 2000م .

51 ـ منح الجليل شرح على مختصر سيد خليل. ، تأليف: محمد عليش. ، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1409هـ – 1989م.

52 ـ موطأ الإمام مالك، تأليف: مالك بن أنس أبو عبدالله الأصبحي، دار النشر: دار إحياء التراث العربي – مصر – تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

53 ـ مواهب الجليل لشرح مختصر خليل، تأليف: محمد بن عبد الرحمن المغربي أبو عبد الله، دار النشر: دار الفكر – بيروت – 1398، الطبعة: الثانية .

54 ـ المهذب في فقه الإمام الشافعي، تأليف: إبراهيم بن علي بن يوسف الشيرازي أبو إسحاق، دار النشر: دار الفكر – بيروت .

# ( نووسەر لە چەند دێرێکدا )

1- دکتۆر ئەحمەد کوڕی شێخ موحەمەدی کوڕی شێخ تەهای کوڕی شێخ عەلی بالیسانیە ، بەڕەچەلەك بۆ بەرێز سەید موحەمەدی زاهیدی کە ناسراوە بە پیر خدری شاهۆیی دەگەڕێتەوە ، کە ئەویش دەچێتەوە سەر حەزرەتی حوسێن کوڕی ئیمامی عەلیﷺ.

2- لە سالی 1950ز لە بالیسان لە دایك بووە کە دەکەوێتە پارێزگای هەولێر لە هەرێمی کوردستان0 بەهۆی گۆزەگۆزی باوکی لە خزمەتیا بووە وەکو منالّ بۆ بیارەو هەولێرو کۆیەو کوبەیسەو بەغدا ، لە سالّی 2004ز هاتوەتەوە هەولێر .

3-خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی سەرەتایی(ئیبن ئەلوستەوفی) لە هەولێر سالّی1962ز وە قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی کۆیسنجاق لە قەزای کۆیە سالّی 1965ز وە دواناوەندیشی لە قەزای هیت لە سالّی 1967ز تەواوکردووە .

4-پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی لە ئەنبار سالّی 1969ز تەواو کردووە، لە سالّی 1971 ز تا سالّی 1990ز کاری لە بواری خوێندن و فێرکردن کردووە لە هەردوو پارێزگای ئەنبارو بەغدا.

5- لە سالّی 1971 ز چۆتە کۆلیژی (دراساتی ئیسلامی) ئێواران وە دەرچووە بە پلەی زۆر باشە لە سالّی 1975 ز.

6- بڕوانامەی ماستەری بە پلەی نایاب لە سالّی 1989ز وە دەست هێناوە ئینجا بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستە ئیسلامیەکان لە سالّی 1994ز بە پلەی نایاب وە دەست هێناوە ، پسپۆڕی لە فیقهی موقارەن وە دەست هێناوە.

7- لە ساڵی 1991ز لە کۆلیژی زانستە ئیسلامیەکانی زانکۆی بەغدا دامەزرا، لە چەند کۆلێژێك وانەی وتووەتەوە، وەك زانکۆی موستەنصریە و زانکۆی ئیسلامی و کۆلیژی سەندیکای مامۆستایان، هەروەها لە ساڵی 1999ز بە گرێبەست لە زانکۆی (ئەحقاف) لە یەمەن وانەی وتووەتەوە.

8- لە ساڵی 2004ز گواسراوەتەوە ، لە زانکۆی بەغدا بۆ زانکۆی کۆیە لە قەزای کۆیسنجاق لە هەرێمی کوردستان ، وە لە 2007ز گواسراوەتەوە بۆ زانکۆی سەلاحەددین، وە ئێستاش هەر بەردەوامە لە کۆلیژی (یاسا و رامیاری) لە هەولێر.

9- زانستیە شەرعیەکان و عەقڵییەکان لە لای باوکی شێخ محمدی بالیسانی خوێندووە ئیجازەی زانستی لێ وەرگرتووە، هەروەها لە ساڵی 1997ز ئیجازەی لە زانستە شەرعیەکان وەرگرتووە لە لایەن سەرۆکی زانایانی بەرێز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس خوا لێی خۆشبێت.

10- زۆر جار پێشنوێژو وتار خوێن بووە لە جێگای باوکی هەندێك جاریش لە شوێنی تر وەك مزگەوتی نوعمان لە بەغدا.

11- ئێستا خاوەن ئیمتیازە لە گۆڤاری چرای ڕوناکی لە هەولێر کە بە زمانی کوردی دەردەچێت پاشکۆشی هەیە بە زمانی عەرەبی.

دانەرو سەرپەرشتیاری دەزگای ڕوناکییە لەگەڵ پوختیەك لە زانایانی ئایینی بەرێز کە بریتیە لە گۆڤارو مەلبەندی لەبەرکردنی قورئان وئیستگەی ڕادیۆی ڕووناکی.



# ناوەڕۆك